



ناوی کتێب: یاداشتنامەی مامۆستایەک

ژ. بەرگ: شەشەم

نووسەر: وەهبی وەققاس ئۆغڵوو

وەرگێڕ: د. زانا ئەحمەد

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٦٣٧)ی ساڵی ٢٠٠٩ ی پێدراوە

# پێشەکی

بە ناوی ئەو خودایەی هەر خۆی شایانی پەسن درانە. درووود لەو پێغەمبەرەی دەوای دەردی دڵان و بینایی چاوانە، هەر وەك لەسەر گشت شوێن پێهەڵگرانی بێت تا ڕۆژی دوایی.

سوپاس بۆ خوا گیان کە یارمەتیی داین، ئەم بەشەش وەك دوا بەشی (یاداشتنامەی مامۆستایەك) تەواو بکەین و بیکەین بە دیاری بۆ شەیدایانی.

یەکەم بەرگی ئەم زنجیرەیە سێ ساڵ لەمەوبەر بڵاو کرایەوە. سوپاس بۆ خودا دەنگ دانەوەیەکی باشی هەبوو و لەگەڵ دەرچوونی دووەم بەرگدا، ناچار بووین یەکەمەکەش چاپ بکەینەوە. ئێستاش کە ئەم شەشەم بەرگە دەکەوێتە بەر چاوی خوێنەران، گشت بەرگەکانی لە بازاڕدا نەماون، بۆیە هەموویان پێکەوە چاپ دەکرێنەوە، بە جۆرێك بەرگی یەکەم بۆ چوارەم جار چاپ دەکرێتەوە! کە شتی وا زۆر بەدەگمەن لە کتێبخانەی کوردیدا ڕوو دەدات.

***

ساڵی پار لە گەشتێکمدا بۆ شاری ئیستەنبووڵ، سەرم لە وەشانخانەی (نەسیل) دا، کە نووسەر هەندێك سەروکاری لەگەڵدا

هەیە. لەویێ چاوم بە نووسەر کەوت، چەند نوسخەیەکیشم لەو پێنج بەرگە بەدیاری دایێ. کە ئەو بەرهەمانەی خۆیی بە کوردی بینی، زۆری کەیف هاتەوە. ئینجا بەشداریی پێکردم لە یەکێك لە بەرنامە هەفتانەکانی لە ڕادیۆی (مۆڕاڵ ئێف ئێم) بە ناوی (دڵ لە ماندوو بوون تێر نابێ) کە تایبەتی کرد بە گوتوبێژ دەربارەی ڕەوشی ڕامیاری و ڕووناکبیری لە هەرێم و چۆنیەتیی وەرگێڕان و پەرۆشیی خوێنەوارانی کورد بۆ ئەو کتێبانە. پاشان بەناو یەکە یەکەی بەشەکانی وەشانخانەکەدا گەڕاین و هەندێك لە بەرهەمەکانی خۆی پێشکەش کردم، لە نێویاندا گشت بەرگەکانی ئەم زنجیرە کتێبە کە چاپی (٢١٦)یان بوو!

***

لە کاتی وەرگێڕانی ئەم کتێبانەدا زۆر هەوڵم داوە کە تام و چێژیان نەشێوێن. لە کاری وەرگێڕاندا زۆر سوودم لە شێوازی وەرگێڕانی هۆزانڤان و ڕۆشنبیری ناسراوی گەلەکەمان (هەژاری موکریانی) وەرگرتووە، هەوڵم داوە لەو بوارەدا شوێن پێی ئەو هەڵبگرم. دەوترێ وەرگێڕانی سەرکەوتوو ئەوەیە کە لە کاتی خوێندنەوەدا، خوێنەر هەست بەوە نەکات ئەوە نووسینێکی خۆماڵی نییە و وەرگێڕراوە. کۆششێکی بێوچانم داوە بۆ ئەوەی ئەم کتێبانە

بەو شێوەیە دەربچن. بۆیە لە کاتی پێویستدا، خۆم زۆر وابەست نەکردووە بە دەقە ئەسڵەکە. کاتێك پەندێکی تورکی هاتبێ، ئەگەر پەندێکی کوردیم دەست کەوتبێ هەمان مانا بگەیەنێ، کوردییەکەم داناوە.

ئەوەی ڕاستی بێت، وەرگێڕانی ئەم کتێبانە زۆر ماندووی کردم. کەسێك دەستی نەبردبێ بۆ وەرگێڕان لە هەر زمانێکەوە بۆ کوردی، ناتوانێ وێنای ئەو ماندوێتی و سەختییانە بکات. ئەمەش بەو مانایە نا کە زمانەکەی ئێمە لەوانی تر کەمتر بێ، نا هەرگیز! بەڵکو ئەمە هۆی تری هەیە و گرنگترینیشیان نەبوونی فەرهەنگی دانسقەیە. تۆ سەیر بکە، چی فەرهەنگی کوردییە هەوڵی تاکە کەسین. بەڵام لە زمانەکانی تردا فەرهەنگەکان لەلایەن ئەکادیمی و زانکۆکان و یان هەر هیچ نەبێ دەستەیەك زمانزانەوە ئامادە دەکرێن، بۆ نموونە فەرهەنگی ئۆکسفۆرد و کامبریج و ...هتد. ئینجا چەندین فەرهەنگی قەبە لە سەر وێبسایتەکاندا هەن. بەڵام بەداخەوە لەلای خۆمان وا نییە. بۆیە جاری وا هەبووە مانای وشەیەکم لە هیچ فەرهەنگێکدا دەست نەکەوتووە و ماوەیەکی زۆر پەکم لەسەری کەوتووە تا ئەوەی لە بەساڵاچووێك یان گوندییەکم پرسیوە، ئینجا ئەو وشەیەم دەست کەوتووە.

***

لە كاتی دارشتنەوەشدا تا زانیبێتم و پێم كرابێ، هەولّم داوە بە كوردییەكی پەتی بنووسم و خۆم بەدوور بگرم لە كەوتنە ژێر كاریگەریی زمانانی ترەوە. بۆ نموونە: ناوی مانگەكانم هەر بە ژمارە هێناوە، وەك ١٧ی دوانزە نەك ١٧ی كانوونی یەكەم و ...هتد. چونكە ئێمە هەمیشە مانگەكان بە ژمارە ناو دەهێنین نەك ئەو ناوانەی كە هیچ پەیوەندییانەی بە كوردییەوە نییە.

هەردەم ژمارە (عدد)یشم خستووەتە پێش ژمێرراو (معدود)ەوە، وەك: یەكەم سالّ، دووەم بەرگ...هتد، كە لە بنجدا لە زمانی كوردیدا وایە، وەلێ زۆر كەس دەنووسێت سالّی یەكەم، بەرگی دووەم...هتد، كە ئەمەش وەرگێڕانێكی دەقاودەقی عەرەبییە، چونكە لەو زمانەدا وەهایە. یان نووسیومە خوا پەرس لە جیاتی خوا پەرست، كە لە رێزمانی كوردیدا وشەكە دەبێ وای لێبێ.

زۆر جار خوێنەر كە ئەو شتانەی لەم كتێبەدا بەرچاو دەكەوێ، وا دەزانێ هەڵەی چاپن!

هەولّیشم داوە تاك و تەرا وشەی زمانزاكانی تر و ناوچە جیا جیاكانی كوردستان بەكار بێنم. ئەمەش وەك هەولّێكی خاكی بۆ تێكەلّ كردنی ئەو زمانزایانە، كە پێم وایە ئەمە ئەركی سەرشانی هەموو دلّسۆزێكە. بەندە خزمەت كردنی زمان بە ئەركێكی ئاینی دەزانم، چونكە هەر وەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، زمان یەكێكە لە

بەڵگەکانی خودا: ﴿وَ مِنْ آيَاتِـهِ خَلْـقُ السَّـمَاوَاتِ وَ الأَرْضِ وَ اخْـتِلاَفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَ أَلْوَانِكُمْ﴾ — الروم: ٢٢ . لەورا خزمەت کردنی زمان، خزمەت کردنی یەکێك لە بەڵگەکانی خودایە. ئەوەتا کەڵە زانایەکی وەکو مـەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس کاتێك خەریکی ڕاڤـە کردنـی قورئـان بـووە، هاو کات خـەریکی ڕاڤـە و لێکدانـەوەی دیـوانی هۆزانڤانـانی کـوردیش بووە.

***

لەم سالآنەی دواییدا تەکانێك بە ڕەوتی ڕۆشنبیرییەوە دیارە و زۆر کتێبی خۆماڵی و وەرگێڕدراویش بڵاو کراونەتەوە. ئەوە جێی سەرنجە کـە بەرهەمـە خۆماڵییـەکان کـەمترین و بەرهەمـە وەرگێڕدراوەکـانیش زۆرترین خوێنەریان هەیە. دەبینی کەڵە نووسـەرێکی خۆمـان کتێبێـك دەنووسیّ، نیو ئەوەندەی نووسەرێکی بیانی کـە ڕەنگـە نووسـەرێکی ئەوەنـدە گـەورەش نـەبیّ، بەرهەمەکـەی ڕەواجـی نییـە. ڕەنگـە لای هەندیّ کەس هۆکاری ئەمە بەوە لێك بدرێتەوە کە گـەلی ئێمـە بێگانـە پەرسە و ...هتد، بەڵام بە بۆچوونی من وا نییە و بـەڵکو هۆکارەکـەی ئەوەیە کە شێوازی نووسینی ئەوان بە جۆرێکی تـرە و باشـتر لەگـەڵ ناخی مرۆڤدا دەدوێن. بە هەر حاڵ، جێی خۆیەتی لێکۆڵینەوە لەسـەر هۆکارەکانی ئەوە بکریّ، تا نووسەرانی ئێمەش بـەو جـۆرە بنووسـن،

سا خوایە ڕۆژێك دابێ خوێنەرانی گەلانی تریش ئاوا چاوەڕوانی وەرگێڕدرانی بەرهەمی نووسەرانی ئێمە بن!

***

لێرەدا جێی خۆیەتی سوپاسی گشت ئەو کەسانە بکەم کە هاندەرم بوون بۆ تەواوکردنی ئەم ئەرکە و بە جۆرێك لە جۆرەکان یارمەتیدەرم بوون. بەتایبەت دایك و باوك و هاوسەر و خوشك و برا خۆشەویستەکانم کە ئاسانکارییان بۆ کردم و بەرگەی ئەو مژوولییەی منیان گرت و لەو ماوەیەدا ئەرکەکانی منیشیان ڕادەپەڕاند. ڕێز و حورمەتم بۆ برایانم لە کتێبخانەی مەحوی هەیە، کە چاپەکانی پێشووی ئەم کتێبانەیان لەئەستۆ گرت. سوپاسی خوێنەرانیش دەکەم کە پەرۆشی و هەڵنان و نزای ئەوان نەبوایە، ئەم کارە بەپایان نەدەگەیشت. هەر وەك جێی خۆیەتی یادی برای بەڕێزم (ئومێد شوانی) بکەمەوە. کاك ئومێد ئەگەر چی نەخۆشییەکی لە زگماکەوە لەگەڵدا بوو، وەلێ ئەوەندە بەئومێد و گەشبین و چالاك بوو، لەو ڕووەوە بووبوو بە مامۆستای ئێمەومانان. خەمخۆرێکی ئەم زنجیرە کتێبە بوو، بە جۆرێك، وا خەجاڵەتباری دەکردم، هەموو جارێك کە کتێبەکان لەچاپ دەردەچوون، یەکەم نوسخەم بۆ ئەو دەبرد. تا دەکەوتە بازاڕەوە، ئەم هەمووی دەخوێندەوە. زۆر هەواڵی شەشەم

بەرگیشی دەپرسی، بەڵام داخی گرانم بەر لەوەی ئەم بەرگە سەردەربێنێ، ئەو بۆ یەك جاری سەری داخست. ئێمەی دۆستانی، ئەگەر هەستمان نەکردایە ئەو ئێستا لەگەڵ کەسانێکدایە کە زۆر لە ئێمە زیاتر خۆشی دەوێن و خۆشیان دەوێ، بەرگە گرتنی دووریی زۆر ئاستەم دەبوو. گۆڕی پڕ لە نوور بێ. دڵنیام خوێنەران کە ئەم دێڕانە دەخوێننەوە، ڕەحمەتی بۆ دەنێرن.

***

ئێستا هەست بە ئاسوودەیی دەکەم کە ئەو کتێبانەی لە هەرەتی لاویمدا کاریگەرییەکی زۆریان لەسەرم هەبوو، وەربگێڕمە سەر زمانی دایکم، تا هاوزمانانیشم هەمان سوودی لێببیننەوە. نووسەر لە پێگە تایبەتە ئەلیکترۆنییەکەی خۆیدا بەم جۆرە وەسفی ئەم کتێبانە دەکات "ئەوانەی لەم ٣٥ ساڵەدا ئەم کتێبانەیان خوێندەوە، شەیتان بەئاسانی نەیتوانی لەخشتەیان بەرێت". پێم وایە بەڕاستی ڕۆڵێکی وایان هەیە. ئەگەر خوێنەرانیش دوای خوێندنەوەیان نەگەیشتبنە ئەو قەناعەتە، ئەوە هەمان ئەو قسەیەی سەرەتا دووبارە دەکەمەوە کە "سووچ لە وەرگێڕەکەیەتی".

نووسەر گەلێك کتێبی تری لەم جۆرەی هەن، بریا مژوولیی ڕۆژگار ڕێگەی دابااین درێژەمان بە وەرگێڕانی بەرهەمەکانی ئەو کەڵە

پەروەردەکارە بدایە. بەڵام ئومێدەوارین کەسانی تر درێژە بەو کارە بدەن.

***

خوایە گیان! ئەم کارەمان لێ قبووڵ بکەیت بە چاکتر لەو نیازەی هەمانبووە، بیشیکەیتە مایەی سوود بۆ گشت ئەوانەی دەیخوێننەوە... ئامین...

لەگەڵ ڕێز و خۆشەویستی و نزام بۆ خوێنەران، بەو هیوایەی ئەوانیش لە نزاکانیان بێبەشمان نەکەن...

د. زانا ئەحمەد محەمەد نوور
zanaahmad@yahoo.com
ئورفا، ١ی یانزەی ٢٠١٢



# ئایین چییە؟

## باوەڕ هێنان و نەهێنان...

## جیاوازیی نێوانیان ئەوەندە زۆرە!...

"ئایین گەورەترین هێزێکە زاڵ بووبێت
بەسەر مێژووی مرۆڤایەتیدا."
(بنیامین کۆستانت)

ئەوەندە پێناسەی جیا جیا بۆ ئەم مەسەلەیە کراوە... کاتێک ئەوانەشی هاتووەتە سەر کە ئاین ڕەت دەکەنەوە.

(عائیشە) تەواو سەری لێشێوابوو. بۆیە دەمودەست بڕیاری خۆی دابوو: لێتوێژینەوەیەک لەسەر ئایین دەکات و هەوڵ دەدات هەقیقەتی بۆ دەربکەوێت.

عائیشه، له پۆلی یانزەهەمی ئامادەیی بوو. کچی دراوسێکەمان بوو. کچێکی تا بلێی ژیر بوو و سەعیشی زۆر دەکرد. قسەکردن لەگەڵی، هەر بەڕاستی خۆش بوو. چونکە دەیزانی چۆن گوێ دەگرێت. بەڵام ئەو بەڕێزی و خۆشەویستییەی نەدەبووە ڕێگر لەوەی بیر و بۆچوونەکانی خۆی دەرببڕێت. لەنێو ئەو کەشوهەوا خۆشەویستی و ڕێزەیدا، هەندێ جار ڕەخنەشی لە وتەکانم دەگرت. بەڵام ئارامگر بوو، دەیزانی دان بەخۆدا بگرێت. بۆ تێگەیشتن لە بابەتێکی گرنگ، بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەی زۆری لەبەر چاو دەگرت.

ئەم تایبەتمەندییەی بووبووە هۆی ئەوەی بەچاو تەمەنەکەی، زۆر تێگەیشتوو و پێگەیشتوو دیار بێت، بۆیە دەستخۆشیم لێدەکرد. حەز دەکەم ئەو باسوخواسەی لەگەڵ ئەودا کردمان، بۆ ئێوەش بەپوختی بیگێڕمەوە:

عائیشە وتەنی: ئاین گەلێك پێناسەی بۆ کراوە، وەلێ ئەوە نییە ئەو پێناسانە پێچەوانەی یەکدی و لەگەڵ یەکدا ناکۆك بن. ئەو پێناسە جیاوازانەی بۆ ئاین کراون، هەر یەکەو ڕوویێکی ئاین زەق دەکەنەوە.

هەندێك لەو پێناسانە، باس لە بەشی بیروباوەڕ لە ئایینەکان دەکەن. چونکە ئایین کۆی باوەڕەکان لەخۆ دەگرێت. هەندێکی

تریشیان هەوڵ دەدەن لە ڕوانگەی پەرستشەکانەوە پێناسەی ئایین بکەن، بۆیە وای لێك دەدەنەوە کە ئایین بریتییە لەو پەرستشانەی بۆ خودا دەکرێن. هی واش هەیە لە ڕوانگەی ئاکارەکانەوە ئایین وەردەگرێت. ڕاستە، ئامانجی ئایین ئەوەیە ئاکارە جوانەکان بەسەر تاك و کۆمەڵدا زاڵ بکات.

بەڵام بە شێوەیەکی گشتی، ئەو پێناسەیەی کۆدەنگیی لەسەرە ئەمەیە:

"ئایین ئەو شێوازی ژیانە ڕاست و جوانەیە کە خودای گەورە لە ڕێی پێغەمبەرانەوە(سەلامی خوایان لێ بێ) بۆ مرۆڤایەتیی ناردووە".

سەرچاوەی ئایین، خودای گەورەیە. ئەو خودایە فەرمان و قەدەغە (ئەمر و نەهی)یەکانیی بۆ ئەو کەسە بژاردانەی لەنێو مرۆڤەکاندا هەڵیبـژاردوون (پێغەمبەران) ڕەوانە کردووە. ئەم زاتە هەڵبژێردراو و نموونەییانە کە نێردەی خودان، ئەو فەرمانانەی بۆیان هاتووە، بەر لەهەر کەسێك خۆیان جێبەجێیان کردوون. بەم جۆرە بە شێوەیەکی بەرجەستە دینی خودایان پیشان داوە. ئەوەی لە خودایان وەرگرتووە، بێ هیچ دەست تێوەردان و لێدەرهێنانێك گەیاندوویانەتە خەڵکی. هەندێك لە پێغەمبەران(سەلامی خوایان لێ بێ) ئەو کتێبەی کە بۆ خۆیان دابەزیوە و هەندێکیشیان ئەوەی بۆ هی پێش خۆیان دابەزیوە، کەوتوونەتە بڵاو کردنەوەی.

هەر کاتێك کتێبێکی پیرۆز کە خودا ناردبێتی، لەلایەن خەڵکییەوە دەستکاری کرابێت، قسەی مرۆڤی تێوەردرابێت و لە ئەسڵەکەی دوور خرابێتەوە، کتێبێکی تر ڕەوانە کراوە. چی کۆمەڵێکی مرۆڤایەتی هەبووە لەسەر ڕووی زەوی، پێغەمبەرێکی هۆشیار کەرەوەی بۆ ڕەوانە کراوە. هەر گەلێکیش بۆی ڕەوانە نەکرابێت، بە بەرپرسیار دانەنراوە لەبەرانبەر ئەرکە ئاینییەکاندا. ڕێك وەك ئەوەی کە قوتابی پرسیاری لێناکرێت و تاقیکردنەوەی پێناکرێت لە وانەیەك کە بەبەتاڵی ڕۆیشتووە...

ئەو ڕێسایانەی باوەڕ و ڕەوشت و پەرستش کە خودای گەورە بە ناوی ئایین بۆ مرۆڤایەتیی ناردوون، بەردەوام مەرجێکی بێ سێ و دوو بوونە بۆ ژیانی خۆش و پڕ لە کامەرانی. وەلێ مەخابن، زۆرێك لە مرۆڤەکان لە گرنگیی ئەو ڕێسایانەی باوەڕ و پەرستش نەگەیشتوون و ویستوویانە بەپێی ئەو هێڵانە بژین کە خۆیان کێشاویانە نەك ئەوانەی خودا کێشاونی، بەڵام گشت ئەوانەی وا بیریان کردووەتەوە سەرەنجام پەشیمان بوونەتەوە و ئەو بەختەوەرییەی بەشوێنییەوە بوونە، نەیاندۆزیوەتەوە. چونکە ئەوەی لە هەموو کەس باشتر بەو مەرجانە دەزانێ کە دەبنە مایەی بەختەوەریمان، زاتی ئەڵلایە. چونکە ئەوە بەدیهێناوین و ئەوەشی لە هەمووان زیاتر لە بونیادی ماددی و مەعنەویمان شارەزایە، هەر ئەوە. بۆیە تەنها و تەنها خودای

گەورە دەتوانێ ئەو هێلانەی بەختەوەرییمان بۆ بکێشێ کە لەگەڵ بونیادی ئێمە یەك دێتەوە.

هەر لەبەر ئەمەیە مرۆڤەکان هەمیشە پێویستیان بە ئایین هەبووە. بەدرێژایی مێژوو جڤاکێکی بێدین، بوونی نەبووە. گشت جڤاکێك خاوەنی دینێك بووە، جا ڕاست بووبێت یان چەوت. چونکە ئاین شتێك نییە بەم دوا دواییانە بووبێت بە پێویستیمان، بەڵکو لەوەتەی هەین پێویستیمان پێی هەبووە و هیچ کاتێك بێئەو نەمانکراوە.

ئەوەی ئەقڵی لە مێشکیدا بێت، مەراق دەیگرێ لەسەر بونیاد و بەدیهێنرانی خۆی، حەز دەکات بزانێت لە کوێوە هاتووە و بۆ کوێ دەچێت.



وەڵامی ڕاست و دروستی ئەم پرسیارانەش، تەنها ئایین لەباریدایە بیداتەوە. مرۆڤ وەڵامی ئەو پرسیارانەی کە نەیتوانیوە خۆی لێیان لا بدات، تەنها لە لێکدانەوە ئاینییەکاندا توانیویەتی بیاندۆزێتەوە. ئەوانەش کە لێکدانەوە ئاینییەکانیان بەهەند وەرنەگرتووە، لەنێو مزرە ئاڵۆزە

جۆربەجۆرەکاندا گیریان خواردووە و نەیانتوانیوە لە حەپەسان و دۆش دامان خۆیان ڕزگار بکەن.

ئەمە ئەوە دەردەخات کە مرۆڤ بالاترین و شکۆمەندترینی بەدیهێنراوانە. تەواوی بوونەوەرانی تر، خراونەتە بەر فەرمان و خزمەتکاریی ئەم بوونەوەرە بالایەوە. مرۆڤ بۆ ماوەیەکی کاتیی لەسەر زەوی کراوە بە میوان. ئەوانەی ماوەکەیان تەواو دەبێت، بەرەو جیهانی ڕۆژی دوایی دەکەونە ڕێ. جیهانی ڕۆژی دواییش دوو بەشە: ئەوانەی کە لە میوانخانەی دونیادا بەپێی فەرمانەکانی خودای گەورە ژیاون، بەرەو مەملەکەتی جوانییەکان کە (بەهەشت)ی ناوە، ئەوانەش کە لاسارییان کردووە بەرەو شوێنی سزا کە ناوی (دۆزەخ)ە، دەڕۆن.

## لە کوێوە دێین و بۆ کوێ دەچین؟

یەکێك لەو ڕۆژانە بوو کەلەگەڵ عائیشەدا قسەوباسمان لەسەر ئەم بابەتە دەکرد. لە ڕێ چاوم پێی کەوت. لێم پرسی کە داخۆ لە کوێوە دێ و بۆ کوێ دەچێت. وتی: "لە ئاکسەرایەوە دێم و بۆ بایەزید دەچم[1] ". بەلام لەبەر ئەوەی کچێکی ئاقڵ و ژیرە، یەکسەر دایە پێکەنین و وتی:

---

١- ناوی دوو شوێنن لە ئیستەنبووڵ – وەرگێڕ.

" لەلای خواوە دێین و بۆ لای ئەویش دەچینەوە..."

عائیشە هەندێك وەڵامی جوانی تریش فێر بووبوو. ئـەوە نییـە زۆر جار هەندێك پرسیار هەر وا دەکەین، وەك "چی هەیە، چی نییە؟"... ئێوە چۆن بەرسڤی ئەم پرسـیارە دەدەنـەوە نـازانم، لـێ عائیشـە بـە "خودا هەیە و هاوبەشی نییە" وەڵامی دەدایەوە. بەم جـۆرە بـۆ ئـەو پرسیارانەی هەر وا بەڕەمەکی دەکرێن، وەڵامی زۆر مانادار و بە ڕامان هێنــەری دەدایــەوە، بەمــەش دەبــووە هــۆی ئــەوەی خــودا بــە بـیر بەرانبەرەکەی بێنێتەوە و پاداشت بەدەست بهێنێت.

هەر کات پێشنیازێکت بۆ عائیشە بکردایە و بتوتایە: "تۆ دەڵێیـت چی؟"، بەخۆشییەکەوە و یەکسەر، دەیوت "دەڵێم خوا!".

ئێمـە لـەم دونیایـەدا میـوانین. ئایـا ڕێ بـە میـوان دەدرێـت لـەو شـوێنەی بـۆی هـاتووە، بـە کـەیفی خـۆی چـیی بوێـت بیکـات؟ ئایـا دەتوانێـت هـیچ حسـێب بـۆ خـاوەن مـاڵ نـەکات و چـۆنی بوێـت ئـاوا هەڵسوکەوت بکات؟ گومانی تێدا نییە کە دەبێت میوان بەپێی حـەز و خواستی خانەخوێکە بجووڵێتەوە و کارێك نـەکات نارەحـەتی بکـات. باپیرانمان وتوویانە: "میوان بەرخۆلەی خاوەن ماڵە".

"میوان ئەوە دەخـوات کـە دەخرێتـە پێشـی نـەك ئـەوەی حـەزی لێیە."، ئەم پەندی پێشـینانەش گوزارشـت لـەوە دەکـات کـە حـەز و ویستی خاوەن ماڵ دەخوا نەك هی میوان.



Cumhurbaşkanı Demirel, din ve laiklik konusunda açıklamalarda bulundu

# Müslüman ülkede kimse dinden rahatsız olmasın

Cumhurbaşkanı Süleyman Demirel'e göre, nüfusun yüzde 99'unun müslüman olduğu bir ülkede kimsenin dinden rahatsız olmaya hakkı yok.




ئەوەتا سەرۆك كۆماریش باسی ئەوەی كردووە كە كەس لە ئاین زیانی پێناگات.

ئێمەش لەم دونیایەدا میوانی پەروەردگارمانین. بێگومان ناچاریشین بەو شێوەیە بژین كە ئەو داوامان لێدەكات. ئەگەر بێین و وەك ئەوە بژین كە خۆمان دەمانەوێت و پێشێلی ئەو ڕێسایانە بكەین كە بۆ میوانیی دانراون، ئەوە دەبێ بزانین كە شایانی سزا دەبین. بەڵام لەبەر ئەوەی خودای گەورە حەزی لە سزادان نییە، زوو زوو هۆشداری دەداتە بەندەكانی. ئەو كارانەی دەبێ بكرێن و ئەوانەش كە نابێ بكرێن، جار لە دوای جار ڕوونیان دەكاتەوە. ئەمانە تەنها لە كتێبەكاندا ڕوون ناكاتەوە، بەڵكو نێردەیەكیش ڕادەسپێرێت بۆ ئەوەی ئەوانەی لە كتێبەكاندا هاتوون، بە جوانترین شێوە لە ژیانی خۆیاندا بەرجەستەیان بكەن و پیشانی خەڵكیی بدەن.

ئێمەش ئەگەر بێت و وەك میوانگەلێكی ناوازە، پێغەمبەرمان ﷺ زانیارییەكانی نێو قورئانی چۆن پیشانداوە، ئێمەش وا بكەین و لە

ژیانماندا بەرجەستەی بکەین، ئەوە دەکات ڕێی ژیانێکمان بۆ خۆمان دۆزیوەتەوە کە خۆشترین و پڕترینە لە کامەرانیی.

ئەوانەی پابەندیی لەو ڕێسایانە ناکەن کە ئایین داینـاون، ئـەوا ژیانیان بە دەستی خۆیان لەخۆ تاڵ کردووە. چونکە بەو بنەمایانەی باوەڕ کە ئایین هاوردوونی، ڕۆحی مرۆڤ شاد دەبێت، ڕاستەوخۆ بە خودای گەورە دەبەسترێتەوە، متمانە بەو دەکات و پشتی پێدەبەستێت. بەم جۆرەش دەگات بە ئاسوودەیی. ئەوانەی کە بڕوایان بە خودا هەیە و پشتی پێدەبەستن، هیچ شتێك نایانترسێنێت. هەر بۆیە تووشی خەیاڵی خراپ و نائارامی نایەن.

چونکە وەك ئەوە ڕاست و دروست دەبن کە خودا فەرمانی داوە، پەیوەندییان لەگەڵ کەسانی تردا دۆستانە دەبێت. لەبەرئەوەش کە لە ناهەقیی خۆ بەدوور دەگرن، خوێن و قین و ئێرەیی دروست نابێت، بەم جۆرەش شەڕ و دووبەرەکیی نایاتە کایەوە.

ئایین وامان لێدەکات گشت مرۆڤایەتیی بە بەندەی خودا بزانین، پەرە بە هەستی یەکسانی و دادپەروەری دەدات و زاڵیان دەکات بەسەر جڤاکدا. هەر بۆیە ئایین ئاسوودەیی و ئاشتیی و ئارامییە.

کەسێك پابەندی یاساکانی ئایین بێت، ئەوە هەم ئاسوودەیی بۆ خۆی و هەمیش بۆ دەوروبەرەکەی دێنێت.

## دەبێ لە چ تەمەنێکدا دەست بە جێبەجێ کردنی ئەرکە ئاینییەکان بکرێت؟

عائیشە ئەم زانیارییانەی لە هەموو شوێنێکدا باس دەکرد. هەر کاتێك ئەو باسە بکرابایەوە، بێ هیچ سڵ کردنەوەیەك دەکەوتە هەڵڕشتنی هەگبەی زانیارییەکانی. نەخاسمە لە کاتی بینینی کەسانی بێباوەڕدا، حەزی دەکرد زیاتر بۆ ئەوان قسە بکات. چونکە سکی پێدەسووتان.

دەیوت: "کێ دەزانێ لەنێو بێسەروبەریی ژیانی بێباوەڕانەدا، لە چ عەزابێکدان؟". بۆیە هەوڵی دەدا چیی لەدەست بێ، درێغیی لێنەکات بۆیان. عائیشە زۆر بەرێزەوە دەئاخفی، زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی بەرانبەرەکەی – جا هەر کەسێك بێ– نەڕەنجێنێ. وەلێ بەداخەوە هەندێ کەس ئەویان دەڕەنجاند. بەڵام وێڕای ئەمە، دڵڕەنجانەکەی زوو دەڕەوییەوە، بەوە دڵی خۆی دەدایەوە کە دەیوت: "چی بکەین، ئێمە بۆ ڕەزامەندیی خودا ئەو قسانە دەکەین، ئیشەڵڵا خێرمان بۆ نووسراوە".

یەکێك لەوانەی ڕەنجاندبووی، مامە پیرەیەك بوو... باوکی یەکێك لە هاوڕێکانی بوو... عائیشە چووبووە لای (ئارزوو)ی هاوڕێی و پێکەوە کەمێك سەعییان کردبوو. پاشان داوای لە هاوڕێکەی کردبوو

یارمەتیی بدات تا نوێژەکەی بکات. لەو سەروبەندەدا باوکی ئارزوو بەسەریاندا هاتبووەوە و بینیبووی عائیشە نوێژ دەکات. لەگەڵ عائیشەدا هەندێك قسەیان لەسەر دین کردبوو. بەڵام لەگەڵ درێژ بوونەوەی قسەکانیاندا، سەرسوڕمانی عائیشەش زیادی کردبوو. ئەم مامەیە نوێژ کردنی عائیشەی بە زوو زانیبوو و وتبووی: "هێشتا نەوجەوانیت، ئایا دەبێ لە ئێستاوە بکەویتە نوێژ کردن؟! "

عائیشەش وتبووی: "لەبەر ئەوەی نازانم کەی دەمرم، بۆیە بیرم کردووەتەوە کە دەبێ هەر لە ئێستاوە دەست بە نوێژ بکەم. ئینجا ئایا ئەو پەرستشە کە فەرمانی خودایە، پێویست ناکات هەر لەو کاتەشدا دەستی پێبکرێت کە ئەو فەرمانی لەسەرداوە؟"...

بەڵام ئەو مامەیە حەزی لە دەمەقاڵە بووە. ئەم جارەیان وتبووی: "ئاخر بێزار دەبیت"... بەدوایدا وتبووی: "هەموو ڕۆژێك و هەر ڕۆژەش پێنج جار... گەلێك زۆرە. زوو بێزار دەبیت و وازی لێدێنیت"...

عائیشە وەك جارانی پێشوو، هەر بەڕێزەوە و بێئەوەی سنوورەکان ببەزێنێت، هەوڵی دابوو بەکورتی وەڵامی بداتەوە:

"– نوێژ خۆراکی ڕۆحمانە. پەیوەندییەکی خۆشە کە لەگەڵ پەروەردگارماندا دەیبەستین. ئێمە بەردەوام پێویستمان بە بەستنی ئەو پەیوەندییە هەیە. لەبەرئەوەی پێویستییەکە دووبارە دەبێتەوە،

بۆیە ئەو شتەی دەبێتە هۆی لابردنی پێویستییەکەش، خۆشی دەبەخشێت نەك بێزاری. بۆ نموونە: ئایا جەنابتان لە خواردنی سێ ژەمە وەڕس و بێزار دەبن؟!"

بێگومان ئەو مامەیەمان بێدەنگ بووبوو. بەڵام عائیشە درێژەی پێدابوو: "لە ڕۆژانە خواردنی سێ ژەم وەڕس و بێزار نابن، چونکە پێویستییەکە دووبارە دەبێتەوە و خواردنیش کە پێویستییەکە بۆ نەهێشتنی ئەو پێویستییە، دووبارە پێویست دەبێتەوە. باشە ئەی پێویستیی ڕۆحمان؟!... بۆ ئێمە هەر لە جەستە پێکهاتووین؟"

عائیشە هەم بۆ ئەوەی گفتوگۆکە درێژە نەکێشێ و هەمیش بۆ ئەوەی کەشەکە هێمن بکاتەوە، هۆزانێکی لە دەفتەرە شیعرییەکەی هەڵبژاردبوو و لەوێدا خوێندبوویەوە... ئیدی دەقاڵێکە وەرچەرخابووە سەر دەمەتەقێ. بەقەدەر ئارزوو و دایکی، باوکیشی سوپاسگوزار بووبوو. عائیشە ئەو دەستخۆشییەی زۆر بەهەند وەردەگرت کە لەو ڕۆژەدا لێی کرابوو. باوکی ئارزوو وتبووی: "کچەکەم! دەستخۆشیت لێدەکەم کە کچێکی باوەڕداریت و پەرستشەکانیشت بەجێ دێنیت. ئینجا زانیارییەکی باشیشت دەربارەی باوەڕەکەت هەیە. لەو چایخانەیەی کە من بۆی دەچم و هی خانەنشینانە، گەلێك برادەر هەن نوێژ دەکەن. وەلێ زۆربەی زۆریان

هیچ زانیارییەکیان لەسەر ئەم بابەتانە نییە. ئەگەر قسە بکەم، لێم تووڕە دەبن و پێما هەڵدەشاخن و هەر ئەوە دەمێنێ لێم بدەن."

عائیشە زۆر بەم قسانە دڵخۆش بووبوو. دەیوت: "ئەم جارەیان بچمەوە، وای لێدەکەم دەست بە نوێژیش بکات. کتێبێکیشی بە دیاری دەدەمێ".

منیش هۆگری ئەو هۆزانە بووم کە عائیشە لەوێدا خوێندبوویەوە. ئێوەش مەراقتان کرد، وا نییە؟ دە مادام فەرموون، ئەمەیە ئەو هۆزانە خۆشەی عائیشە خوێندبوویەوە:



## دیین

کە کتێبێك ئەخوێنی
ئەڵێی: کێیە نووسەری؟
ببینی شاکاری جوان
ئەڵێی: بکەرانی کوان؟

بێخاوەنن ئەرز – ئاسمان؟
گشت تێدەگەین بە ڕامان
هەرچی هەیە دەردەخا
خوایەك هەیە، بەتوانا





ئەرکە لەسەر شان هەمووان
بناسین کردگارمان
ئەمە ئەرکمانە، وەلێ
دینە تێمان دەگەیەنێ

ڕێی چاکە و چاکیی کردار
هەر بەوە دەبێت دیار
گشت چاك بزانن: دینە
یاسای ویژدان، ڕێی ژینە



خودا بۆ ئێمەی بەشەر
ناردی قورئان – پێغەمبەر
بەو دووانە پێمان دەڵێ
ڕێی باشە ئەوەتانێ

چی فێڵ، درۆ، گزییە
لە دیندا جێگەی نییە
گشت باشن، هەرچی دینە
لێ ئیسلام گەورەترینە



(ئیبراهیم عەلائەددین گۆڤسا)[1]

---

١- (بۆ سەرلەنوێ دارشتنەوەی بە کێش و سەروا، کەمێك دەستکاری کراوە – وەرگێڕ)

## یادگارییەکی زۆر سەرنج ڕاکێش

ڕۆمان نووسی بەناوبانگ (پەیامی سەفا) دەنووسێت:

شەوی ڕابردوو زەنگی تەلەفۆنی ماڵەوەمان لێی دا. دەنگی (د.عەلی سائیب)ی ئەندامی پێشووی فیدراسیۆنی زۆرانبازان بوو:

- یادگارییەکی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە. ئۆڵۆمپیاتی ساڵی ١٩٥٢ بوو لە هێلسینکی (پایتەختی فینلەند). وەرزشوانە ئەمەریکاییەکان، من و (ئەشرەف شەفیق)یان تووشی سەرسوڕمان کرد.

هەر زوو لە باخچەی ئۆتێلەکەدا کلێسایەکی گەڕۆکیان دامەزراند. گەنجە وەرزشکارە ئەمەریکاییەکان، هەر هەموویان بێئەوەی یەکیان خۆی دابڕێ، بەرگی ڕەشیان پۆشی و لەگەڵ قەشە و ڕاهیبێکدا کەوتنە دوعا کردن. پاشان یەك بە یەك بە بەردەم ڕاهیبەکەدا تێپەڕین و سەر و دانەیەکیان لەو بنێشتانە وەرگرت کە خرابوونە نێو ئاوە پیرۆزەکەوە. لەبەردەمیدا خۆیان چەماندەوە.

لە ئاست دینداریی ئەو وەرزشوانانە، من و ئەشرەف شەفیق حەپەساین و هەستمان بە شەرمەزاریی کرد.

(ڕۆژنامەی ،میللییەت، ٦ی یەکی ١٩٥٦)

## ئایا ئەوەی مرۆڤ دەیکات، بەبەلاش دەڕوات؟

خۆ عائیشە ئەوە یەکەم جاری نەبووە تووشی شتی وا ببێت. جاری وا هەبووە، ڕووبەڕووی بێباوەڕیی زۆر سەرسەختانەتر بوودتەوە. جارێکیان لەگەڵ یەکێکی وادا تێکیان گیرکردبوو:

"- تۆ باسی باوەڕ و پەرستش دەکەیت. نوێژ دەکەیت و ڕۆژووش دەگریت... باشە ئەی ئەگەر وەك ئەوەی تۆ دەیڵێیت، ڕۆژی دوایی نەبێت و بەهەشت و دۆزەخ ڕاست نەبن، چی دەکەیت؟ هەموو ئەوەی کردووتە بەبەلاش دەڕوات، توخوا حەیف نییە؟! دەکا لە هیچ و خۆڕایی و بە دەستی خۆت ئازادیی خۆتت بەرتەسك کردووەتەوە...

ئەمە گەوجی نییە؟"

عائیشە لەبەر ئەوەی زۆر ڕووبەڕووی پرسیاری لەو جۆرە بووبووەوە، هیچ نەپەشۆکابوو. بە قسەیەکی ئیمام عەلی دەمکوتی کردبوو:

"- من بۆیە پەرستش دەکەم، چونکە باوەڕم بە خودا و ڕۆژی دوایی هەیە و پاداشت و سزاش بەڕاست دەزانم. پەرستشەکان نەبوونەتە بار بەسەرمەوە. بەڵکو بەپێچەوانەوە، بەهۆی ئەو پەرستشانەوە ژیانی خۆمم ڕێك خستووە، لە خراپەکاریی خۆم بەدوور دەگرم و هەوڵ دەدەم چی باش و ڕاستە، ئەنجامی بدەم.



"زانست و دین نکوولّی لە یەکتر ناکەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە، یەکتری تەواو دەکەن. چونکە یەکێك لەمانە ڕووناکیی ئەقڵ و ئەوی تریشیان ڕووناکیی دڵە. مرۆڤیش نە تەنها لە ئەقڵ و نە تەنهاش لە دڵ پێکهاتووە. بەڵکو بوونەوەرێکە خاوەن ئەقڵ و دڵیشە.. زانست بە بێدین، ڕەنگە ئەقڵ تێر بکات، لێ بێگومان دڵ ڕەش دەکات

دینی بێ زانستیش ڕۆح و دڵ ڕووناك دەکاتەوە، لێ ئەقڵ لە تاریکیدا دەهێڵێتەوە.

خۆشنوودیی مرۆڤایەتیی نە وەك ئەوەی ئەمڕۆ تەنها بە زانستەوە بەندە، نە وەك ئەوەش کە لە چەرخەکانی ناوەڕاستدا هەبووە، تەنها بە دینەوە پەیوەستە. بەڵکو بە بوونە خاوەنی هەردووکیان لە هەمان کاتدا دێتە دی."

(عەلی فوئاد باشگیل)

ئیرادەم بەهێز بووە. بەهۆی باوەڕ بوونیشم بە ڕۆژی دوایی، لە ترسان لە مردن ڕزگارم بووە. لەبەر ئەوەی بڕوام بە خودا هەیە و پشتی پێدەبەستم، ورەم بەردەوام بەرزە.

ئەگەرچی وا نییە بەلام گریمان ئەوەی تۆ دەیلێیت ڕاستە، ڕۆژی دوایی بوونی نییە و شتێکیش نییە بە ناوی بەهەشت و دۆزەخ... ئەگەر واش بێت، من چیم زەرەر کردووە؟! جوان کردن و ڕێك

خستنی ئەو ژیانی دونیایەی هەیە و بەسەربردنی ژیانێکی بێ گێرمەوکێشە، مەگەر خۆی بۆ خۆی دەستکەوت نییە؟

بەڵام ئەی ئەگەر وەك ئەوەی من دەیڵێم ڕۆژی دوایی هەبێت، ئەوسا حاڵی تۆ چی دەبێت؟! کاتێك لەو دەرگایەوە کە پێی دەوترێ مەرگ، بچیتە جیهانی پەسلانەوە و ڕاستییەکان ببینیت، حاڵت چۆن دەبێت؟ تەنانەت هەر ناشمەوێ بیر لە شتی وا بکەمەوە..."

## لەخۆبایی بوونی بێمانا و، بەردەوام بوون لەسەری هەڵەی بەدوادا دێ

بەڵێ، ئێ خۆ وتم عائیشە کچێکی ژیرە. ئینجا بەردەوامیش خەریکی خوێندنەوەیە و پەرە بە زانیارییەکانی دەدات. پەرستشەکانی بە زانینەوە ئەنجام دەدات نەك کوێری کوێرانە. پێویست بکات، دەتوانێ ئەوە ڕوون بکاتەوە چی بۆچی دەکات. بێگومان ئەمە بۆ کەسێك کە لە تەمەنی ئەودا بێت، تایبەتمەندییەکی زۆر نموونەییە. ئاخر لەبەر ئەم هۆیانەیە، کە من گەلێك خۆشم ئەوێ. دەتوانم تاوتوێی بابەتی زۆر قورسی لەگەڵدا بکەم. عائیشە باکی لە ڕەخنەی بنیاتنەر نییە و بگرە سوپاسگوزاریش دەبێت... خۆیشی ڕەخنە دەگرێ، وەلێ زۆر بەڕێزەوە. ئەگەر بتوانیت

بۆچوونێك كە ڕێك پێچەوانەی ئەوە بێت كە ئەو داكۆكیی لێدەكات، لە ڕێی زانستی و ئەقڵ و مەنتیقەوە بۆی ڕوون بكەیتەوە، ئەوە بێ سێ و دوو لێت وەردەگرێت. تەنانەت لەبەرانبەر ئەوەی لە بەهەڵەدا چوونێك ڕزگارت كردووە، دەست خۆشیشت لێدەكات.

بەڕای من ئەم تایبەتمەندییە، بەتایبەت بۆ گەنجان، زۆر پێویست و گرنگە. چونكە ئەوان بەگشتی گیرۆدەی لەخۆبایی بوونی بێمانا دەبن و سوور دەبن لەسەر ئەو هەڵانەی خۆیان پێیان ڕاستە. تووشی چیرە درێژیی: "چیم وت، هەر ئەوەیە" دەبن و ڕوو لە ڕاستییەكان وەردەگێڕن. ئەمە لەكاتێكدا كە موسوڵمان دەبێ هەق ویست بێت. واتە هەق و هەقیقەتی لە كوێ و لە كێ بینی، پشتگیریی و خاوەنداریی لێبكات. ئەمە زۆر گرنگە.

ئەی مەگەر پشتگیری نەكردنی ڕاستییەكان لەبەر خۆبەگەورەزانین، تایبەتمەندییەكی شەیتان نییە؟

ئینجا خۆ مەرجیش نییە لە هەموو دەمەتەقێیەكدا ئیللا تۆ براوە بیت. ئەگەری ئەوە هەیە بەهەڵەدا بچین، چونكە مرۆڤین. دوور نییە ڕاست بە چەوت و چەوتیش بە ڕاست ببینین. ئەگەر ئەوەی ئێمە دەیڵێین ڕاست نەبێت، براوەی ڕاستی ئێمە دەبین. چونكە ئەمە دەبێتە هەلێك بۆ ئەوەی هەڵەیەكمان ڕاست بكەینەوە. بەڵام ئەگەر لایەنی براوە بین، ئەوە دەكات هیچ شتێكی نوێمان بەدەست

نەهێناوە و دوور نییە تووشی لەخۆبایی بوونیش ببین. کە ئەمەش یەکێکە لە سیفەتەکانی شەیتان.

هەندێك لە گەنجان بەهۆی لەخۆبایی بوونی بێمانـاوە، تەنانـەت گوێ لە هەندێك ئامۆژگاریی ڕاست و بەجێی دایك و باوکیشیان ناگرن. سوود وەرنەگرتنیش لە ئەزموونـەکانی ئـەو دووانـە، چ نوقسـانییەکی گەورەیە...

ئێستا وەك بڵێی گوێم لە تانەی بەشێك لـە گەنجانـە: "ئایا گشـت داواکارییەکی دایك و باوکانمان لە بەرژەوەندیی ئێمەدایە؟ هەندێ جار ئەوەی دەیانەوێ بۆ بەرژەوەندیی ئێمەیان نییە، بۆ خۆیانـە. هەنـدێ جاریش هیچ پێکانێك لە ئامۆژگارییەکانیاندا نییە. لە ڕۆژگـاری ئـەمڕۆ و لە ئێمەش تێناگەن. بێئاگان لەو هەلومەرجەی ئێمەی تێداین..."

ڕاستە، ڕەنگـە حاڵـەتی واش هـەبێت. وەلـێ لـە کـاتی وادا، ئێمـە لەسەرمانە چی بکەین؟ دیسـانیش هـەر ئـەرکی سـەر شـانمانە دڵیـان نەشکێنین. مەگـەر لەسـەرمان نییـە بـێ تێکـدانی کەشـوهەوای ڕێـز و خۆشەویستیی، ئەو ڕاستییانەی دەیانزانین، بیانڵێین؟ ئەوەشمان بـیر نەچێت، هەندێك جار دەتوانین لە بۆچوونی هەڵەش، ئـەنجامی ڕاسـت دەربێنین و سوودی لێوەربگرین. هەر هیچ نەبێت، وامان لێـدێت زیـاتر ئاگامان لەخۆ بێت بۆ ئەوەی نەکەوینە هەمان ئەو حاڵەتانەوە.



"باوەڕ بە بەدیهێنەری گەردوون، گەورەترین هێزی بزوێنەری توێژینەوەی زانستییە."

***

"زانستی بێدین نابینا و دینی بێزانینیش شەلە."

(ئەلبەرت ئەنیشتاین)

مرۆڤی ژیر ئەوەیە کە لە هەڵەی ئەوانی دی پەند وەردەگرێت، هەڵناسێ خۆیشی هەمان هەڵە تاقیی بکاتەوە، سەیری ئەوانە دەکات کە پێش ئەو تاقییان کردووەتەوە، ئینجا بڕیاری خۆی دەدات. نموونە خراپەکانیش هەر ڕێی ڕاستمان پیشان دەدەن. هەر بۆیە ئیمامی عەلی لە ئاست پرسیاری: "تۆ لە کێوە فێری ئەم ئاکارە جوانانە بوویت؟"، بە: "لە پیاو خراپانەوە" وەڵامی داوەتەوە...

بەڵێ، دەبێ سەیری پیاو خراپان بکەین و ڕووە خراپەکانیان هەڵگێڕینەوە ئینجا لێیان وەربگرین... هەرچی پیاو چاکانیشە، نابێ قەت دەرس لێوەرگرتنیانمان بیربچێت...

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: "الْحِكْمَةُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ فَحَيْثُ وَجَدَهَا فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا" واتە: "دانایی (ئەو زانیارییانەی تایبەتن بە ئاکار و ڕاستی) هی موسوڵمانە. لە هەر جێیەك بیدۆزێتەوە، ئەو شایانترە پێی".

## گشت جوانییەكان مولّكی ئیسلامن

ئیسلام دەیەوێت مرۆڤەكان بە جۆرێك بژیێنێت گونجاو بێت لەگەڵ خەلقیدا. هەر شتێك لەگەڵ پێكهاتە و خەلقی مرۆڤدا گونجاو بێت، لەگەڵ ئیسلامدا یەك دەگرێتەوە و هی ئیسلامە. بۆیە ئەركی سەر شانی موسوڵمانە لە هەر شوێنێك و لای هەر كەسێك جوانییەك ببینێتەوە، یەكسەر وەریبگرێت و جێبەجێی بكات. تەنانەت هیچ ڕێگرییەكیش نییە لەوەی هەر ڕاستی و جوانییەك لە غەیرە موسوڵمانیش ببینێت، وەریبگرێت.

پەسەند كردنی ئەوەی كە هەموو ڕاستی و جوانییەك خۆی لە خۆیدا هی ئیسلامە، بنچینەی ئەم بۆچوونەیە. هەموو جوانییەك هی ئاینی خودایە. هەر كەسێك بەڕاستی باوەڕی بەو هەبێت، پێویستە خۆی بكاتە خاوەنی ئەم ڕاستییانە و بیانخاتەوە واری ژیانەوە.

بەڵام ئەفسووس، هەندێ جار دەبینین ڕەوشەكە بە جۆرێكی ترە. موسوڵمان لە حاڵەتی وادا دەبینین كە لە ئاكاری ئیسلامیی ناوەشێتەوە. لە هەمان كاتیشدا دەبینین فەلەیەك زۆر بەتوندی دەستی بە ئاكارێكی ئیسلامییەوە گرتووە. بۆ نموونە: موسوڵمانێك كە درۆ دەكات و فەلەیەك كە نایكات، وا نییە؟ موسوڵمان ئەو ڕاستڕەوییەی هەق وایە خاوەنداریی لێبكات، تۆراندوویەتی و لە خۆیی دوور خستووەتەوە... فەلەیەكیش كردوویە بە هی خۆی... دەتوانین

سەعی کردن، باش بەکار هێنانی کات و پاکژی و چەندین شتی هاوشێوەیان، وەك نموونە بێنینەوە. فەلەکان باوەڕیان بەوە هێناوە کە هەندێ ڕێسای ئیسلام لە بەرژەوەندییاندایە، بۆیە خاوەنداریيان لێکردوون... ئێستا ئەگەر موسوڵمانان لەوان بڕوانن و هەوڵ بدەن ئەو جوانییانە - کە لە ئەسڵدا هی خۆیانە- بەدەستی بخەنەوە، کارێکی خراپ دەکەن؟

ئەوەی ڕاستی بێت، موسوڵمانان گەلێك شتیان لە بیانییەکانەوە وەرگرتووە؛ لێ لەم وەرگرتنانەدا نەیانپێکاوە... واتە ئەوەی دەبوو وەربگیرێ، وەرنەگیرا. ئەوانەش کە نەدەبوو وەربگیرێن؛ خێرا وەرگیران و خرانە واری ژیانەوە. ئەوەی کە دەبوو لە خۆرئاوا وەریبگرین، زانست و تەکنۆلۆژیا بوو. لێ ئێمە بێکەڵکترین خوو و ڕەوشتەکانیانمان هێنایەوە وڵاتمان. بێمانا ترین مۆدێلەکانیانمان لاسایی کردەوە.

بەم جۆرە لە مۆدێلە بێکەڵکەکانی جڤاکە خۆرئاواییەکاندا بەدوای خۆشیی و کامەرانیی گەڕاین نەك ڕێساکانی ئاینەکەمان. ئەگەرچی ئەوە سەدەیەك تێپەڕی؛ لێ هێشتا ئەو کامەرانییەی بەدوایدا وێڵ بووین، نەماندۆزیوەتەوە. ئەمەش لەبەرئەوەیە کە لە ناونیشانێکی دروستدا بەدوایدا نەگەڕاوین.

## "باسی پەروەردگارمان بۆ دەکەیت؟"

لـە سـالآنی دەوروبـەری ۱۹۳۵دا دەسـتەیەك خوێنـدکاری ئامادەیی، سـەر لـە پیـاوێکی گـەورەی ئیسلام دەدەن و پێـی دەڵێن:

– مامۆستا! باسی خودامان بـۆ دەکـەیت؟ پـەروەردگارمان پێدەناسـێنیت؟ چـونکە لـە قوتابخانـەدا مامۆسـتاکانمان هـیچ باسی خودامان بۆ ناکەن. سەرباری ئـەوەش (حاشـا!) دەڵـێن: خودا نییـە، سروشـت ئێـوەی بـەدیهێناوە، هۆکارەکـان خـەلقی کردوون.

باشە ئێمە پەروەردگارمان لە کێوە و چۆن بناسین؟

ئەو زاتە گەورەیە، بە خەمێکی قووڵەوە گـوێ لـەو قسـانەی ئەو گەنجە بێگوناهانە دەگرێت. ئەم ئامۆژگارییەیان دەکات:

– ڕۆڵەکانم! ئێوە گوێ لەو زانستانە بگرن کە دەیـانخوێنن. هەر زانستێك کە دەیخوێنن، بە زمانی حاڵی خۆی و بەو ڕێسـا و یاسـایانەی لـەخۆی دەگـرێ، لـە خـودا دەدوێ و پـەروەردگار دەناسێنێت. ئێوە گوێ لەو تەڵقینـدەرە نکوولێکارانـە مـەگرن، بەڵکو گوێ لەو زانستانە بگرن کە تەڵقینی باوەڕ دەدەن.

## با ئەو شتانەی ونمان کردوون،

## لە جێی خۆیاندا بەدوایاندا بگەڕێین

کە قسە هاتە سەر ئەمە، بەسەرهاتێکی پەند ئامێزی مەلا مەشهوورم بۆ عائیشە گێڕایەوە. ئێوەش مەراقتان کرد، وا نییە؟ دوور نییە بەهۆی ئەمەوە، چەند (فاتیحە)یەکیشی بۆ بخوێنن.

ڕۆژێکیان مەلا مەشهوور ئیسکیفەکەی (ئەو شتەی دەخرێتە سەر پەنجە بۆ پاڵنان بە دەرزییەوە– وەرگێڕ) لە خەڵوزەکەی ناو ژێرزەمینی خانووەکەیدا لێدەکەوێت. ئەو ئیسکیفە زۆر گرانبەها بووە و یادگاریی چەندان ساڵە بووە. چەنێك بەدوایدا دەگەڕێت، هەر نایدۆزێتەوە... چونکە لەو سەردەمانەدا کارەبا نەبووە، فانۆسیش ئەوەندە ڕووناکیی نەبووە. وا دیارە لەسەر ئەرزیش خەڵوزێکی زۆر کەوتووە. مەلا مەشهوور گەلێك خەفەتی بۆ دەخوات.

لە ماڵ دەچێتە دەرەوە و دەکەوێتە گەڕان لەبەر ڕووناکییەکەی کۆڵاندا... ئەوانەی بەوێدا تێدەپەڕن بەزەییان پێدا دێتەوە، بۆیە دەکەونە گەڕان لەگەڵیدا. بەڵام دوای گەڕانێکی زۆر، هەر نادۆزرێتەوە. دەڵێن:

–مەلا! ئەو هەموو زەلامە ئەم ناوەمان سەراوژێر کرد. چۆن ئیسکیفێك تازە ونت کردبێ، ئاوا نادۆزرێتەوە؟ دە بەچاکی بیری لێبکەوە، بەشکوم بیرت بکەوێتەوە لە کوێ ونت کردووە.

مـەلا مەشـهوور هەڵوێسـتەیەك دەكـات، بیرێـك دەكاتـەوە، ئینجـا دەڵێت:

– ئیسکیفەکەم لە خەڵووزەکەی ژێرزەمینەکەمدا ون کرد.

ئەو پیاوانە کە لە گەڕان شەکەت و ماندوو بووبوون، گشت پێکەوە توورەیی دەردەبڕن:

– ئاخر توخوا مەلا! ئیسکیفێك لە ژێرزەمیندا ون بکـرێ، لـە ڕێـی بەرماڵدا دەدۆزرێتەوە؟!

مەلاش هیچ خۆی تێك نادات:

– ئێ چی بکەم؟! ئەوێ زۆر تاریك بوو. منیش وام پێ بـاش بـوو لە ڕووناکیدا بەدوایدا بگەڕێم!

ئێمـەش مـەلا مەشـهوور ئاسـا، لـە ناونیشـانی هەڵـەدا بەشـوێن کامەرانیـدا گـەڕاین. پێمـان وا بـوو کامـەرانی لـە لای خۆمـان و لـە بیروباوەڕەکەمانـدا نییـە، بـەڵکو لـە نـەریت و مۆدێلـەکانی ئـەو ئەورووپایەدایە کە دەرەوەی چراخان و ناویشی تاریکستانە...

مەلا مەشهوور بەم بەسەرهاتە، دەرسـێکی باشـی ئەوانـەی داداوە کە فام دەکەن.

ئایا ئەو مرۆڤە خۆرئاواییانەی کە خۆیان کامەران نـین و بەدەسـت ماددەپەرستی و خۆپەرستییەوە دەناڵێنن، دەتوانن ببن بـە نموونـەی کامەرانیی بۆ ئێمە؟

## دڵخۆشیی لە کوێدایە؟

ئــەوەی کــە لــە هــەموو کەسـێك باشــتر مـرۆڤ دەناسـێت، بەدیهێنەرەکەیەتی. ئەوەش کە لە هەمووان باشتر دەزانێت چۆن و بە چی دڵخۆش دەبێـت، هـەر ئـەوە. بۆیـە دڵخۆشـیی و کامـەرانیی لـەو شێوازی ژیانەدایە کە خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەستنیشـانی کرووە. باشترین نموونەی ئەم شێوازی ژیانەش لە ژیننانەی پێغەمبەر ﷺ دا ڕەنگ دەداتەوە.

ئا ئەو شێوازی ژیانەی کە پـەروەردگارمان فـەرمانی لەسـەرداوە و پێغەمبەریشـمان ﷺ جـوانترین نموونـەی پێشـکەش کـردووە، نـاوی ئایینە.

ئایین ئەو بانگهێشتنامەیەیە کە لەلایەن خودای گەورەوە و لە ڕێی پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ ئێمە نێردراوە. ئەم بانگهێشـتنامەیە بانگهێشـتی ئێمە دەکات بۆ ئەوەی هەم لەم دونیـا و هـەمیش لـەو دونیـا شـادمان بـین. هــەموو مەســەلەش لــەوەدا خـۆی دەبینێتــەوە کــە بــەپێی مەرجەکانی ئەو بانگهێشتنامەیە هەڵسوکەوت بکەین.

## بریسکەکانی ژیریی لە نەوەی نوێوە

مامۆستایەکی خوانەناس، دوای ئەوەی گیرفانی پڕ لە نوقڵ دەکات، بە قوتابییە منداڵکارەکانی دەڵێت:

– ئەگەر خودا هەیە، داوای نوقڵی لێبکەن، بزانم دەتانداتیێ؟ بەڵام من لەبەر ئەوەی هەم، ئەگەر داوا بکەن، دەتوانم بتاندەمێ. ئینجا دەمودەستیش...

زیرەکترین قوتابیی پۆلەکە، لە نیازی مامۆستاکەی تێدەگات و پێی دەڵێت:

– من حەزم لە نوقڵ نییە، مامۆستا گیان! ئەگەر تکات لێبکەم لە جیاتیی ئەوە، سێوێکم بدەیتێ، دەتوانی بمدەیتێ؟ ئینجا دەمودەستیش؟!...

مامۆستای خوانەناس، لەبەرانبەر ئەو منداڵەدا دۆش دادەمێنێت و دەمی دەبێ بە تەڵەی تەقیو.

***

مامۆستاکەی بیرکاری شێوە «بینراوەکان»ی لەسەر تەختەڕەش کێشا و وتی: "وا بزانم هی واشتان لەنێودایە کە باوەڕی بەو شتانەش هەیە کە نایانبینێ".

یەکێك لە قوتابییەکان وەڵامی دایەوە:

– بێگومان، مامۆستا!

مامۆستاکە پێی وت:

– بڕوانە، ڕۆڵە! هەق وا نییە مرۆڤ ڕێگە بە خۆی بدات باسی شتێك بكات كە نەتوانێ ئاوا بیخاتە گۆڕێ و بە دەست ئامـاژەی بـۆ بكات.

وەلێ ئەو وەڵامەی شایانی بوو، دیسان لە هەمان قوتابییەوە وەریگرت:

– مامۆستا گیان! جەنابتان كە منداڵەكەتان خۆش دەوێت، دەتوانن ئەو سۆزەتان، بە دەست ئامـاژەی بـۆ بكەن؟ كاتێك یارمەتیی هەژارێك دەدەن، دەكارن هەستی بەزەیی پێدا هاتنەوەتان بخەنە سەر مێز؟ ئەی مەگەر ئەم هەستانە، كە ناتوانن دەستیان بۆ ببەن و لەو ناوە دایانبنێن، لە جەنابتاندا نین؟

***

مامۆستا بۆ سەر لێتێكدانی قوتابییەكانی وتی:

– منداڵەكان! ئەگەر خودا حەز دەكات هەموومان بچینە بەهەشت، بۆ یەكسەر نەیخستووینەتە بەهەشتەوە و ئێمەی ناردووەتە سەر زەوی؟

یەكێك لە منداڵەكان، وەڵامی پرسیارەكەی دایەوە:

– مامۆستا! بێگومان جەنابت حەز دەكەیت هەموومان دەربچین و ئەم پۆلە تێبپەڕێنین. باشە بۆ سەرو «دە»یەكمان نادەیتێ و دێیت تاقیكردنەوەمان پێدەكەیت؟!



## بتپەرسی دواکەوتوویيە

### ئایا بتپەرسان خودا دەناسن؟

مرۆڤ هەندێ جار وا گومڕا دەبێت
بتی دەستکردی خۆی ئەکاتە خوا
تۆفیق فیکرەت

بێئەقڵانەترین کاری مرۆڤە خاوەن ئەقڵەکان، بت پەرستیانە. واتە ئەوەی کە هەڵدەسن کۆمەڵە ڕەسم و پەیکەرێك دەپەرسن کە بە دەستی خۆیان دروستیان کردوون.

چوونه بەرانبەر شتێك کە لەلایەن خۆتەوە دروست کرابێت و وتنی: "تۆ منت بەدی هێناوە" پێی، شتێکی زۆر بێمانایە... هۆزانڤانێك بەم جۆرە گوزارشت لەو گومڕاییە دەکات:

مرۆڤ هەندێ جار وا گومڕا دەبێت
بتی دەستکردی خۆی ئەکاتە خوا

بتی بەستەزمان... زمانی هەبوایە و بیتوانیایە بێتە گۆ، ڕەنگە بەر لە هەر کەسێك خۆی ئەم کارەی ڕەخنەباران بکردایە:

"ئەرێ کابرا! ئەوە چییە پێم ڕادەبوێریت؟! من بوونەوەرێکی بێگیان و بێفامم. وێڕای ئەوەش دەستکردی مرۆڤێکی وەك تۆم. ئیتر ئەوە چییە بە من دەڵێی خودا و دەمپەرسی؟"

بەڵێ، ئەو بتانەی دەپەرسرێن، ئەگەر زمانیان هەبوایە، ڕووبەڕووی ئەوانە دەبوونەوە کە دەیانپەرسن...

بە درێژایی مێژوو، کاتێك خەڵکی خودایان بیر چووەتەوە، پەرسراوی ساختەیان داهێناوە. چونکە نەیانتوانیوە بێباوەڕ بژین. جا یان پەروەردگاری ڕاستەقینەیان دۆزیوەتەوە، یانیش لەجێی ئەودا، شتێکی تر کە هەر ئەو خولقاندوویەتی، کردوویانە بە پەروەردگار. ئەمەش ئەوە پیشان دەدات، مرۆڤ ناتوانێت باوەڕی نەبێت. چونکە باوەڕ سەرەکیترین پێویستیی ڕۆحمانە. ئەم حاڵەتە

بە چی دەچێت؟ بەوە دەچێت کەسێك خۆراکی چنگ نەکەوێت، هەوڵ بدا بە گیا و کا بژی، وا نییە؟

## کەسێك ژیر بێ، بت دەپەرسێ؟

(فکرییە) کچێکە خاوەن فکری ناسکە. ئەو پرسی: "باشە ماموستا! مرۆڤە خاوەن ئەقڵەکان، چۆن کاری وا دەکەن؟ چۆن شتانێك دەپەرسن بەدەستی خۆیان دایانتاشیبێ؟ ئایا ئەمە خۆخەڵەتاندن نییە؟"

– ئافەرین بۆ ئەو کچەم!... بێگومان ئەمە بەهەڵەدا چوونێکی زۆر گەورەیە... خۆخەڵەتاندنە... باشە، ئێستا من لە ئێوە دەپرسم: ئایا بتپەرسان بەڕاستی باوەڕیان بەوە هەبووە کە ئەو بتانە بەدیهێنەری ڕاستەقینەن؟

زۆربەی قوتابییەکانی پۆل، سەرەتا وتیان: "بەڵێ"، لێ لە ماوەی چەند دەقەیەکی کەمدا بۆچوونی نوێ هاتنە گۆڕێ:

– ماموستا! ڕەنگە زۆربەی ئەوانەی بتیان پەرسووە، لە ترسا وایان کردبێ. چونکە لەو جڤاکانەی کە بتپەرسان زۆرینە بوونە، دەسەڵاتداران گوشاریان بەم ئاڕاستەیەدا کردووە. خەڵکیان ناچار کردووە بتان بپەرسن. ئەوانیش هەر چەندە باوەڕیان پێنەبووە، خۆیان وا دەرخستووە کە باوەڕیان پێیانە.

– باشە، بەڵام ئایا هەموو ئەوانەی بتیان پەرسووە، ئایا لە ترسا پەرسوویانن؟

– نەخێر، کەسانی واشیان لەنێودا بووە کە بەڕاستی باوەڕی بەوە هەبووە کە ئەوان خودان.

– باشە بۆچی؟

– چونکە لەو دەورانەدا، نەفامی زۆر بڵاو بووە. ئینجا لەبەر ئەوەی پێشینانیان، بتپەرسییان تێدا هەبووە، ئەمانیش بێنەوەی بیر بکەنەوە شوێنی ئەوان کەوتوون و درێژەیان بەو کارەداوە.

بەڵام فکرییە دیسان ڕەخنەی هەبوو:

– بە ڕای من، مرۆڤ هەر چەنێکیش نەزان بێت، ئەوە دەزانێت کە بت ناتوانێ بەدیهێنەر بێت. ئەگەر خودای گەورەش بەباشی نەناسێت، هەر لەوە تێدەگات کە ناکرێ شتانێك دەستکردی مرۆڤ بن، بەدیهێنەر بن.

ئەحمەدی چاودێری پۆلیش پشتیوانیی لە بۆچوونەکەی ئەو کرد:

– بەڵێ، بەڕای منیش هەر وایە... زانینی ئەوەی کە کۆمەڵە شت و ماددەیەك بەدیهێنەر نین، ئەوەندە پێویست بە ئاقڵی ناکات. بۆ نموونە: لە ڕابردوودا کەسانی واش هەبوونە کە خۆر و مانگ و گەواڵە و ئەستێرەکانیان پەرسووە... ڕێی تێدەچێ مرۆڤ بۆ ماوەیەکی

کاتیی بە هەڵەیەکی وادا بچێت، لێ ناکرێ و نابێ بە چەند دەستکردێکی بێگیان و بێفام و بێتوانای خۆی بڵێت خودا...

دوای ئەم قسانە، دەستخۆشیم لە پۆل کرد:

– ئافەرین بۆ ئێوە... لەناخی دڵەوە دەستخۆشیی لە هەر هەمووتان دەکەم. چونکە لە مەسەلەیەکی وا گرنگدا، بیر دەکەنەوە و هزر بەرهەم دێنن. ئەگەر بتپەرسانیش بیانتوانیایە وا بیر بکەنەوە، بە هیچ جۆرێك لە مەسەلەی باوەڕدا بەهەڵەدا نەدەچوون.

دەبێ بە یەقینەوە ئەوە بزانین کە زۆربەی زۆری ئەوانەی باوەڕیان بە بت هەبووە، بەڕاستی باوەڕیان بەوە نەبووە کە ئەوانە بەدیهێنەر بن. ئەو بتانەی کە دەیانپەرستن، بە هۆکارێکیان دادەنان لە بەینی خۆیان و خوادا. واتە نەدەهاتن ڕاستەوخۆ پەرستشی خودای گەورە بکەن، دەهاتن پەرستشی ئەو بتانەیان دەکرد کە بە نوێنەر و هاوتا و هاوبەشی خودایان دەزانین. لەبەردەم ئەواندا ڕادەکشان و خۆیان گرمۆڵە دەکرد و هەندێ جاریش قوربانییان دەکرد، پێشیان وا بوو کە بەو شتانە بەندایەتیی خودا دەکەن.

باشە ئەی بۆ ڕاستەوخۆ بەندایەتییان نەدەکرد؟

– بەڵێ، مامۆستا! منیش دەمویست ئەمە بپرسم. مادام دەیانزانی خودا هەیە و دەیانناسی، باشە بۆ هۆکارێکی وایان دەهێنایە نێوان خۆیان و خواوە؟

پرسیارەکەی فکرییەم ئاڕاستەی پۆل کرد. یەکسەر وەڵامەکان کەوتنە هاتن:

– دیارە لەبەر ئەوەی خودایان نەبینیوە، هاتوون هێما بەرچاوەکانی ئەو، واتە بتەکانیان پەرسووە.

– ئافەرین، ئەحمەد! ... ئەم وەڵامە ئەوەندە جوانە، لەوە دەچێ وەڵامی چاودێری پۆل بێ! ئەو کەسانەی ئاستی ڕۆشنبیرییان لاوازە، ناتوانن باوەڕ بەو شتانە بێنن کە نایانبینن. بۆ ئەوەی باوەڕ بە شتێك بێنن، ئیللا دەبێ بە چاویان بیبینن... هەر چی ئەو کەسانەشە کە ئاستی ڕۆشنبیرییان بەرزە، ئەگەر بە چاوی سەریشیان نەیبینن، ئەوە دەتوانن بە چاوی ئەقڵیان بیبینن. واتە دەتوانن بە بیر کردنەوە و بەکارهێنانی ئەقڵ و مەنتیق ببینن. کەواتە ئەو مرۆڤە نەفامانەی کە ئاستی ڕۆشبیرییان نزمە، ئەگەر خوداش بناسن، هەر بەدوای هێما و هەیکەلێکیدا دەگەڕێن لە دەوروبەریاندا هەبێ. دەنا بەتەواوی باوەڕ ناهێنن.

– مامۆستا! ئێستاش کەسی وا دەبینین کە دەڵێت هەر شتێك نەیبینم باوەڕی پێناکەم.

– بەڵێ ڕاستە، بەڵام ئەمە دواکەوتووییە. چونکە ئێمە زۆر شت کە بە چاو بەدییان ناکەین، لە ڕێی زانستەوە دەتوانین بەدییان بکەین

و باوەڕیـان پێبێـنین. ئەمــەمان پێشــتر بــە چــەند نموونەیــەك شــیی کردووەتەوە.

– مامۆستا! ئایا ناشـیٚ بت پەرسـان کـە بـت دەپەرسـن، لەبـەر ئـەوەیان بـیٚ کـە حـاڵی خراپـی خۆیـان دەزانـن، بۆیـە هەسـت بـە شەرمەزاری دەکەن لەوەی ڕاستەوخۆ بەندایەتیی خودا بکەن؟! خودا زۆر بە بەرزی دەبینن و خۆیشیان بە نزمـی... بـۆی هەیـە بڵـێن ئێمـە هەر دەتوانین بەندایەتیی ئەم بتانە بکەین کە نوێنەری ئەون...

## ئایا بت پەرسی بۆ هەندێك کەس سەرچاوەی بژێوی و دەستکەوتە؟

(حەسەن) پەنجەی بەرز کردبووەوە. ئەو زۆر کەم بەقسە دەهات، چـونکە یارمــەتیی باوکــە بازرگانەکــەی دەدا و هــەموو جارێـك بــە ماندوێتیی دەهاتە قوتابخانە.

– بڵێ، حەسەن!

– مامۆسـتا! ئایـا ئـەوەی کـە هەنـدیٚ کـەس وێـڕای ئـەوەش کـە باوەڕیـان بـە خـودا هەیـە بـت دەپەرسـن، ئایا ڕێـی تێناچـیٚ بـەهۆی بازرگانانەوە بێت؟

– یەعنی چۆن؟..

– ئەوانەی بت دروست دەکەن و بازرگانیی پێوە دەکەن، ڕیکلامی زۆر باش بۆ بتەکانیان دەکەن، ڕاستییەکان دەشارنەوە. زۆر کەسی نەفامیش لەخشتە دەبەن. پێیان دەڵێن: ئەگەر بێت و ئەم بتانە بکەنە میانگیرێك لەنێوان خۆتان و خوادا و ئینجا لە خودا بپاڕێنەوە، ئەو کات پەرستشەکانتان زیاتر قبووڵ دەبن و خێری زیاتر بەدەست دەهێنن... ئەوانیش زۆر بە دڵسافی و ساویلکەیی لێیانی وەردەگرن. زۆر کەسی زۆرزان بۆ خۆیان بازرگانیی بە بتەوە دەکەن و خۆیان بەو خەڵکە دەوڵەمەند دەکەن.

کە حەسەن ئەمانەی وت، گشت پۆلەکە کەوتنە پێکەنین. تەنانەت می وا هەبوو گاڵتەی پێدەکرد و هاواری لێ دەکرد:

– حەسەن بازرگان، حەسەن بازرگان!

– منداڵەکان! دەقەیەك... ئایا حەسەن ناهەقە؟ مەگەر لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆشماندا کەسانی وا نین کە خراپترین شت بە ناوی باشترین شت بەسەر خەڵکدا ساغ دەکەنەوە؟ مەگەر کەسانی وا نابینین کە شتانی زیان بەخش بەناوی سوود بەخش بە خەڵکی دەفرۆشن؟



– بەڵام، مامۆستا! داتاشینی خودای درۆینە و فرۆشتنی بە خەڵکی و کردنی ئەم کارە چەواشەکارییە بە سەرچاوەی بژێویی ژیان، کارێکی چەند قێزەونە! کارێکی زۆر سووکە...

دەکرێ هەق بە (ئەسلی) نەدرێ بۆ ئەو بۆچوونەی دەریبڕی؟!

– ڕاست دەکەیت، ئەسلی!... چەواشە کردن و لەخشتە بردنی خەڵکی لە بەرزترین و پیرۆزترین بابەتدا و کردنی ئەمە بە ئامرازێك بۆ بەرژەوەندی، بەڕاستی زۆر خراپە. بەڵام حەیف! لە هەموو دەور و زەمانێکدا کەسانی وا دەرکەوتوون...

## خوداوەندە درۆینەکانی سەردەم

نەماندەتوانی بابەتەکە دابخەین، چونکە ئەحمەدی چاودێری پۆل زۆر بەپەرۆشەوە پەنجەی بەرز کردبووەوە:

– بەڵێ، ئەحمەد! بەو پێیەی بە نیاز نیت دەستت دابگریت، دیارە شتێکی زۆر گرنگت پێیە بیڵێیت...

– مامۆستا! دەمویست نموونەیەك بێنمەوە لەسەر خوداوەندە درۆینەکانی ئەمڕۆ.

دەنگە دەنگەکەی پۆل، زوو نەما. چونکە هەمووان حەپەسابوون بەو قسەیەی ئەحمەد کە وتی نموونەیەك دێنمەوە لەسەر خوداوەندی ساختە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا. شتی وا، چۆن دەبێ؟ چۆن دەبێ

هێشــتاش لــەم ڕۆژگارەمانــدا خوداوەنــدی درۆینــە و ســاختە بــۆ بەرژەوەندیی کەسانێك هەبن؟!...

کە پۆل سەرنجی کۆ کردبووەوە، ئەحمەد هەلەکەی قۆستەوە و وەك بلێی بۆ ئەوەی بەهای ئەوە زیاد بکات کە دەیویست بیلێ، ئیشەکەی کەمێك بەقورسی وەردەگرت. ئەوەی ڕاستی بێ منیش مەراقم کردبوو دەبێ چی بلێت؟! چونکە ئەو لەو کاتەدا خەریکی گەڕان بوو لە جانتاکەیدا. وا دیار بوو، بەلگەشی پێبوو بۆ سەلماندنی قسەکانی.

دوا جار هاتە گۆ:

- مامۆستا! لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆشماندا خوداگەلێك دادەتاشرێن. ئەمانە خوداگەلی ساختە و فوو تێکراون. دەیانەوێت بەتایبەت ئێمەی گەنجان بخەنە دوایان و بەو جۆرە پارە و ناو و ناوبانگ بۆ خۆیان بەدەست بخەن. دوور نییە مەبەستی دیکەشیان هەبێت.

پۆل ئۆقرەی لێهەلگیرابوو. دەیانوت: "ئێ دە یەللا، دە بلێ کێن خوداوەندانی درۆینەی سەردەم"...

ئەحمەد بەدەم هەلدانەوەی ڕۆژنامەکەوە وتی: "ئا ئەوەتا"... لەو لاپەڕەیەدا بە ناونیشانێکی گەورە نووسرابوو: "خوداوەندە تازەکانی لاوان". لەژێرەوەش ناوی چەند گۆرانی بێژێکی خۆیی و بیانی...

پـۆل دەنگـە دەنگـی جیـاوازی لێبـەرز بـووەوە. هەنـدێك لـە قوتابییـەکان دەیـانوت: "بـەڵام ئێمـەش ئەمانـەمان خـۆش دەوێ"، هەندێکی تریشیان پێیان وا بوو کە: "ئەمانە لە مۆسیقا و گۆرانیدا بـە خـودا دادەنـرێن، ئەمـە پەیوەنـدیی بـە باسـەکەی ئێمـەوە نییـە".

هەندێکی تریش دەیانوت: "ئەمانەش وەك ئێمە مرۆڤن. چۆن دەکـرێ پێیان بوترێ خوداوەنـد؟"... هـی واش هـەبوو دەیـوت: "کـوا بـزانم، ناوی کێی تێدایە؟"... ماوەیەك تەماشایان کرد و منیش گوێم بۆ شل کردبوون.

سەرەنجام لەسەر ئەوە کۆك بووین کـە هەڵەیـە بـە گـۆرانی بێـژ و کەسانی تریش بوترێ خوداوەند.

فکرییە مەراقی کردبوو:

– ئایا ئەمانە بەوە نارەحەت نابن پێیان بوترێ خوداوەند؟

لەمەشدا تێڕوانینـەکان جیـاواز بـوون. هەنـدێك پێیـان وا بـوو ئـەو گۆرانی بێژانەی هۆگریانن "کەسانی ئاقڵن و شتی وا قبووڵ ناکـەن" و هی واش هەبوو پێی وا بوو "ئەوانە ئەوەندە بـەخۆ دەنـازن، حـەزیان لێیە وا ناو ببرێن".

حەسەنی بازرگان تێڕوانینێکی جیاوازی هەبوو:

– مامۆسـتا! بـەڕای مـن ئـەو گـۆرانی بێژانـەی نـاوی خودایـان لێنراوە، ئەوەندە تاوانیان نییە... تاوانباری ڕاستەقینە ئـەو دەزگـای

ڕاگەیاندنەیە کە ئاوا بە پیتی گەورە بە خوداوەند ناوی هێناون. هەق وایە ئەوانەی لە ڕۆژنامەی ئاوا بەناوبانگدا دەنووسن، هەڵەی وا نەکەن... بەر لە هەر شتێك دەبێت ئەوە بزانن کە بەپێی بیروباوەڕەکەی ئێمە، ناکرێت بە هیچ کەسێك بوترێ خودا. ئەگەر بەزانینەوە وا بکەن، ئەوا مەبەستی تریان هەیە. بەڕای من ئەو ئامانجەشیان ئەوەیە سەرنجی خوێنەران بۆ لای ڕۆژنامەکانیان ڕابکێشن، تا تیراژی زیاد ببێت و زیاتری لێ بفرۆشن و پارەی زیاتریان دەست بکەوێت... واتە لە پێناوی دەستکەوتی زیاتردا، خوداوەندی تازە دادەهێنن.

ئەو ڕۆژنامەیەی ئەحمەد هاوردبووی، دەست بە دەستی پێدەکرا و بەم هۆیەشەوە لێکدانەوەکان ڕەهەندی نوێیان وەردەگرت. بەڵام ناچار بووین بگەڕێینەوە سەر باسە ئەسڵییەکەی خۆمان... چونکە کە گۆرانی بێژە مۆدەکانی سەردەم هاتە ناو باسەکەوە، بێگومان هەر کەسە و قسەیەکی دەبێ.



– ئازیزەکانم! ئەو بتانەی بە پەیکەر و هێما و نێوانگیری خودا دانراون و لەگەڵ کاتیشدا خراونەتە جێی، هەمووان کەوتوونەتە بەندایەتی کردنی بتەکان نەك خودا... ئینجا بە درێژایی چەندان

سەدەش... بەتایبەت لـە نیمچـە دورگـەی عەرەبیـدا، بـە جۆرێك کـە تەنانەت لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ یشدا، یەکتاپەرسییان پێ هەرس نـەکراوە و بەندایـەتییان بـۆ بتـان کـردووە. باشـە، ئەوانـەی کـە ئـەو بتانەیان بە میانگیر لەگەڵ خودا دانـاوە، بـۆ ڕاسـتەوخۆ باوەڕیـان بـە خودای گـەورە نـەهێناوە؟ یـان ئەگـەر هێناویانـە، بۆچـی ڕاسـتەوخۆ بەندایەتییان نەکردووە؟

یەکەمین هۆی ئەمە، ئەوەیە کە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتـدا ئەوانـەی بـە نێـوانگیری خـودا دایاننـاون، خسـتوونیانەتە پێشـەوە و خودایـان لەبیرچووەتەوە. چونکە ئەوانەی بتەکانیان کردووە بە نێوانگیر لەگەڵ خوادا، خۆی لەخۆیدا ئەو کەسانە بوونە کە لە سیفەتە هەقیقییـەکانی خودا بێخەبەر بوونە، بەتەواوی لە خودا تێنەگەیشـتوون و ئـەو کەمـە تێگەیشــتنەش کــە هــەیانبووە، لەگــەڵ تێپــەڕینی کاتــدا بیریــان چووەتەوە.

بەڵێ لەگەڵ تێپـەڕبوونی کاتـدا، خـودا لـەبیرکراوە، لەدواییـدا ئـەو بتانـە ماونەتـەوە کـە بـە نوێنـەری ئـەو دانـراون. ئەسـڵەکە نـەماوە و ئەوەی بە بریکاری دانراوە، لە شوێنیدا ماوەتەوە...

لەگەڵ تێپەڕینی کاتـدا کڵێساکان پـڕ کـراون لـە بارێـك نیگـار و پەیکەر. بەم شێوەیە باوەڕی یەکتاپەرسی لە مەسیحییەتدا، زیـانی پێگەیشتووە.

## بت پەرسی دواکەوتووییە

ئـەو کەسـانەی ڕۆشـنبیرییان لاوازە و خـاوەن بـیر و بۆچـوونی دواکەوتووانەن، هەر باوەڕ بەو شـتانە دێـنن و وابەسـتەیان دەبـن کـە ماددیین و بە چاویان دەیانبینن. ناتوانن بەتەواوی لەو شتانە تێبگـەن کە مەعنـەویین. واتـە دەرك بـە مەعنـەوییات ناکـەن و لێـی تێناگـەن، تەنها لە ماددییات دەگەن و خووی پێدەگرن.

تێگەیشتن لە مەعنەوییات و باوەڕ پێهێنانی، هەمیشە پێویستی بە ڕۆشـنبیریی بـەرز و زانسـت و بیرکردنـەوەی قـووڵ هەیـە. ئیسـلام بانگهێشـتی مرۆڤایـەتی دەکـات بـۆ ئـەو ڕۆشـنبیرییە بـەرزە، بـانگی دەکات بۆ ئەوەی بە چاوی ئەقڵ و دڵ لەو شتانە تێبگات کـە بەرچـاو ناکەون.

مەسـیحییەکانیش لەگـەڵ تێپـەڕبوونی کاتـدا ئاینەکـەیان لـە بـت پەرسـی نزیـك کردووەتـەوە. کڵێسـاکان تـەژین لـە کۆڵێـك نیگـار و پەیکـەر... نـاتوانن مەعنەوییانـە بـیر لـە خـودای تاقانـە بکەنـەوە. هەمیشە وەك بوونێکی ماددی و بگرە وەك مرۆڤێك دەیناسن. بەڵام لە ئیسلامدا، خودا لە هیچ یەکێك لە بەدیهێنراوەکانی ناچێت. بەو پێیەی ئەو هەموو شتێکی بەدیهێناوە، کەواتە لە هیچ شـتێك ناچێت. باشـە، ئەی دەکرێ شکڵ و شێوە و مرۆڤێك، نوێنەرایەتیی خـودا بکـات؟ بـە تێڕوانینی ئیسلام، نەخێر...

لـەم کلاوڕۆژنەیـەوە، تەنانـەت پێغەمبەریشـمان ﷺ خـودا نییـە، بەشێکیش نییە لێی. وەك ئێمە مرۆڤێکـە و تـەواو. بەنـدەی خودایـە. نـاکرێ بـە نـاوی خـوداوە، تەنانـەت بەندایـەتیی ئـەویش بکرێـت. ئاینەکـەشمان ئـاینی خودایـە. بۆیـە هەڵەیـە بـە ئیسـلامەتی بـوترێ موحەمەدییـەت. چـونکە ئـەوەی لـە ڕێـی قورئانـەوە بنـەماکانی ئـەم ئاینەی داناوە، زاتی ئەڵلایە.

## چارەسەری بت پەرسی یەکتاپەرسییە

پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوەی هەستی بـەوە کـردووە کـە بـۆی هەیـە خەڵکی تووشـی بـت پـەرسـی بـبن، بـۆ ئـەوەی بـاوەڕی یەکتاپەرسـی جێگیر بکات، ڕێگریـی زۆر تاییـەت و گرنگـی دانـاوە. بـۆ نموونـە: لـە پایـەی نیگـاری کـەم کردووەتـەوە. داوای کـردووە لـە کـاتی ڕوو کردنـە ڕووگـەدا، نیگاری زینـدوو لەبەرانبـەردا هەڵنەواسـرێ. پەیکـەری قەدەغـە کـردووە. تەنانـەت بـۆ چـوونە سـەر قـەبرانیش، کۆمـەڵێك ڕێسـا و سـنووری دانـاوە. چـونکە پێشـتر گشـت ئەمانە پەرسـراون. داوای کـردووە جـارێکی دی شتی وا ڕوو نەداتەوە. بۆیە، بۆ خـاتری



ئەوەی باوەڕ بە خودای تاقانە و بەندایەتی کردنی، جێی خۆی بگرێ و مرۆڤەکان هیچ شتێك بە ناوی ئەوەوە نەپەرسن، گشت هۆکارێکی لەناو بردووە. تەنانەت لە ترسی ئەوە فەرموویەتی: "هەر کەسێك وێنەیەکی منی دەستکەوت، با بیدڕێنێ و فڕێی بدات". بەردەوام ڕەخنەی لەوانە گرتووە کە زۆر ڕێزیان لێناوە. تەنانەت کە چووەتە نێو قەرەباڵغییەکەوە، ڕێگریی کردووە لەوەی بۆی هەڵسنە سەر پێ.

کاتێك یەکێك لە حزووریدا شڵەژابێ، ئەو ئەوەی بە شتێکی ناپێویست داناوە و ئەوەی فەرمووە کە ئەو: "کوڕی ژنێکی مەککەییە کە گۆشتی وشککراوەی دەخوارد". شێوازی ژیان و بەرگ پۆشینی، ئەو خانووەی تێیدا ژیاوە، زۆر سادە و ساکار بوونە. خۆی کارەکانی خۆی ڕاپەڕاندووە. بەدەستی خۆی جلوبەرگ و پێڵاوەکانی چاك کردووەتەوە. خودای گەورە پێی فەرمووە ئەگەر بیەوێ ئەو کێوی (ئوحود)ەی بەسەرییەوە وەستاوە، بۆی دەکات بە زێڕ، بەڵام ئەو ڕەتی کردووەتەوە و وتوویەتی: "هەژارییەکەم شانازیمە"...

بەردەوام ئەوەی دووپات کردووەتەوە کە ئەویش بەندەی خودایە. وای دانەناوە بەهەشتی مسۆگەرە و بۆیە دەکرێ خۆی لە پەرستشەکان بەدوور بگرێ، بەڵکو بەپێچەوانەوە لە هەمووان زیاتر پەرستشی ئەنجامداوە. بەم جۆرە هەمیشە جەختی لەوە

کردووەتەوە کە هەڵگری هیچ تایبەتمەندییەکی خوایەتی نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە، بەندەیەکی ئەو خوایەیە.

لەبەر ئەم هۆیانەیە کە بت پەرسی هەرگیزا و هەرگیز لە ئیسلامەتیدا جێی نەبووەتەوە. جگە لە خودا، خوایەتی بە کەس نەدراوە. ئەمە لە کاتێکدا کە فەلەکان حەزرەتی عیسایان بە کوڕی خودا داناوە و بەم شێوەیە جۆرە خوایەتییەکیان پێداوە، تەنانەت حەزرەتی مەریەمەی دایکیشیان پیرۆز کردووە و کردوویانە بە خودا.

هەر بەمەش نەوەستاون، بەڵکو گشت ئەوانەی سەر بە کڵێساکانن بە ڕوهبان دانراون و بە جۆرێك لە جۆرەکان پیرۆزیان کردوون، کردوویانن بە هاوبەش لە خوایەتیدا. بۆیە ئەوان دەسەڵاتی تایبەتیان هەیە. ئەوان کەسانی جیا و تایبەتن. کەسێکیان بەدڵ نەبێ، لە دین دەیکەنە دەرەوە. بە ناوی خواوە، خەڵکی لە گوناهەکانیان پاك دەکەنەوە. خەڵکی تەنها لە ڕێی ئەوانەوە دەتوانن لە کڵێسادا پەرستش بکەن.

هەرچی لە ئیسلامدایە، هەموو ئەمانە لە دەسەڵاتی زاتی خوادان. چینی ڕوهبان بوونی نییە. لە ڕووی بەندایەتییەوە، گشت مرۆڤایەتی یەکسانن. کەس گەرەنتیی چوونە بەهەشتی نییە. موسوڵمانان لە هەر شوێنێك و لە هەر کاتێکدا، بە تەنێ بن یان بەکۆمەڵ، دەتوانن پەرستشەکانیان ئەنجام بدەن. مەرج نییە لەسەریان ئیللا لە مزگەوت

و له دوای کەسانی ئەویٚ پەرستش بکەن. وەلیٚ بێگومان ئەگەر بێت و نوێژەکانیان لە مزگەوت و بەکۆمەڵ ئەنجام بدەن، خێری زیاتر بەدەست دێنن. بۆ بەخشران لە گوناهەکانیان، دەبێ هەر لەبەر خودا بپاڕێنەوە. پێویست ناکات وەك ئەوەی لە مەسیحییەتدا هەیە بچن لەلای قەشە گوناه لەخۆ دەربێنن.



# چۆن بەسەر ترسی مردندا زاڵ دەبین؟

## باوەڕ بوون بە پەسلان و زیندوو بوونەوەی دوای مردن، لە بنەماکانی باوەڕن

"مرۆڤەکان لە خەودان،
لە کاتی مەرگدا خەبەریان دەبێتەوە."
فەرموودەی پیرۆز

ئەو ڕۆژە ڕۆژژمێرەکان ١٧ی دوانزەی ١٩٩٠یان پیشان دەدا. ئەم ڕۆژە ساڵیادی کۆچی دوایی مەولانا (جەلالەددینی ڕۆمی)یە.
کۆڕێکم بۆ گەنجان گێڕا دەربارەی مەولانا. دوای تەواو بوونی ئەو کۆڕە کە دوو کاژێری خایاند، زۆرێك لە ئامادەبووان حەزیان نەدەکرد هەڵسن و بڕۆن. پرسیاری جۆراوجۆریان لەسەر ئەو شتانە کرد کە بۆم

باس کردن. ئـەو پرسـیارەی لـە هـەمووان زیـاتر لەسـەری وەسـتام، دەربارەی تێڕوانینی مەولانا بۆ مەرگ بوو.

گەنجێك وتی:

– "ئایا مامۆستا دەکرێت بە بۆنەی مردنەوە، پیرۆزبایی بکرێت؟" چونکە من بەوە دەستم بە قسەکانم کردبوو کە وتبـووم : "ئـەمڕۆ لێرەدا سالیادی کۆچی دوایی حەزرەتی مەولانا پیرۆز ڕادەگرین."

گەنجێکی تریش وتی:

– "ئەوەی ئێمە بزانین، لە سـالیادی مردنـدا کـۆڕی یـاد کردنـەوە دەگێڕدرێت نەك مورەکبادی".

بێگومان ڕاستیان دەکرد. ڕۆژی مردن یاد دەکرێتەوە و هی لەدایك بـوونیش پـیرۆز ڕادەگیرێـت. لـێ مـەولانا مردنـی خـۆی بـە «شـەوی زەماوەند» داناوە و وەسیێتی کردووە لەباتی ماتەم و خەم، خۆشیی و شادی دەربڕدرێ.

بە تێڕوانینی ئەو، مردن گەیشتنە بە مەعشـووق، ڕزگـار بوونـە لـە بارگرانییەکانی دونیا و گەیشتنە بە یارە ڕاستەقینەکان. مەگـەر ئەمـە لـە بنەڕەتـدا بۆچـوونی هاوبەشـی گشـت موسـوڵمانان و بگـرە گشـت ئەوانەش نییە کە باوەڕیان هێناوە؟

بە ئایینی ئیسلام، مردن نەمان و کۆتا پێهاتن و لەناو چوون نییە، بەڵکو تەنها جێگۆڕکێیەکە لە دونیایەکەوە بۆ یەکێکی دی. هەر بۆیە مەولانا لە دوا نەخۆش کەوتنیدا دەیوت:

"خەریکە دەگەڕێمەوە لای ئەو سوڵتانەی منی هێناوەتە جیهانی بوونەوە."

هاوژینەکەی بە خەمێکی قووڵەوە پێی دەڵێ:

"مەولانا! خۆزگە ٤٠٠ساڵێکی دیکە ژیابایت، تا جیهانت پڕ بکردایە لە هەقیقەتەکان."

مەولانا بەم شێوەیە وەڵامی ئەم خواستەی دەداتەوە:

- "بۆ مەگەر ئێمە فیرعەونین، نەمرووین؟! ئێمە بۆ ئەوە نەهاتووین ئەوەندە لە دونیادا بمێنینەوە. ئێمە لە گرتووخانەی دونیادا زیندانی کراوین. ئومێد وایە بەم نزیکانە بگەینە کۆڕی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ.

ئەگەر ئەرکی ئەوەمان پێنەسپێردرایە کە خەڵکی بێچارە هۆشیار بکەینەوە، بۆ ساتێکیش لەسەر ئەم خۆڵەی دونیا دانەدەنیشتین."

مەولانا کە ناخی پڕ بوو لە ئەوینی خودایی، ئاوا هاواری پەروەردگاری دەکرد:



– "ئـەی رۆحـی جیهـان! وای لێهاتووە ئەم دونیایە لەبەر عەشقی تۆ بەکەڵکی من نایات. من چی لـەم دونیایـە بکـەم کـە منـی لـەو دونیـا کردووە؟!"

تاکە پاسەپۆرت بۆ گەیشتنی بە مەعشـووقی ئـەزەلی و ئەبـەدیی، مردن بوو. ئایا ترسان و هەڵاتن لەو مردنەی دەوای دەردی فیراقـە، کـارێکی ژیرانەیـە؟ چـونکە چەشتنی مردن، تاکە رێی گەیشتنە بە نەمریی. هەر بۆیە بەو کەسـە نزیکانـەی دەوت کە هەستیان دەکرد لـە مـردن نزیـك بووەتـەوە و بـەو هۆیـەوە رەنگیان زەرد هەڵگەرابوو:

"– ئەی عاشقە دەموچاو زەرد هەڵگەراوەکە!

ئارام بگرە و بەوەفا بە بۆ ئەو پەیمانەی داوتە. دەردێك هەیە، لـە مردن بەولاوە دەوایەکی دیکەی نییە. ئیتر من چۆن بڵێم چارەیەك بـۆ ئەم دەردە بدۆزەوە؟

دوێنێ شەو لە خەوما، لە گەرەکی عیشقدا مام ئەختیارێکم بینـی، بە دەستی هێمای بۆ کردم، وەك ئەوەی بڵێ وەرە لای ئێمە."

مـردن بـۆ مـەولانا، لـەدایك بوونـەوە بـوو، گەڕانـەوە بـوو بـۆ نیشتمانەکەی خۆی... ئینجا لە شەکر شیرینتر: "مادام ئـەوەی گیـان دەکێشێت خودایە، کەواتە مردن وەك شەکر وایە. مادام دەمانباتـەوە لای ئەو، مەرگ لە گیان شیرینترە لای ئێمە. مردن بۆ ئەم لایە، مـردن بۆ ئەو لا لەدایك بوونە. لەو لا کەس نامرێ نا، مردن تەنها لێرەیە."

لە هۆزانێکیدا کە لـە دوا ساتـەکانی تەمەنیـدا نووسـیویەتی، وەك وەسیەتێك بۆ کەسانی دوای خۆی، دەڵێت:

"ئـەو ڕۆژەی کـە مـردم، کـە دارەبازەکـەمت نایـە سـەر شـان، وا هەسـت مەکـە پەرۆشـی ئـەم دونیایـە بـووم... بـۆم مـەگری، سـکت پێنەسـووتێم، شـین و شـیوەنم بـۆ مەکـە. ئەگـەر بکەویتـە تەڵـەی شەیتانەوە، ئەوە هی سك پێسووتان و شیوەن بۆ کردنە.

کـە تەرمەکـەت بینـیم، مـەڵێ فیراقـە فـیراق. دیـدار و بەیـەك گەیشتنەوەم ئا ئـەو کاتەیـە. کـە خسـتمیانە گـۆڕەوە، مـەڵێ ماڵئـاوا ماڵئاوا... گۆڕ دەرگای بەهەشتە. کە ئـاوا بوونـت بینـی، هەڵاتنیشـت لەبەر چاو بێت. خۆر و مانگ بە ئاوابوون، چ زیانێکیـان پێـدەگات؟.. تۆ هەر ئاوابوونت لێدیارە، وەلێ ئەوە لە ئەسڵدا ئامادەسازییەکە بـۆ لەدایك بوون، سەرلەنوێ لەدایك بوونەوەیە. گۆڕیش ئاوا لە گرتووخانە دەچێ، لێ لە ڕاستیدا ڕزگار بوونی گیانە لە بەندیی...

هەر تۆوێك كە دەخرێتە ژێر گڵ، كۆتایی نایەت... باشە ئەی بۆ كە دێتە سەر ئینسان، پێت وایە كۆتایی پێدێت؟

چ سەتڵێك خراوەتە بیری ئاوەوە، بە پڕی دەرنەچووە؟.. باشە یووسف كە دەكەوێتە بیرەوە، بۆ بگری؟..

كە لەم بەر دەمت داخست، لەو بەر بیكەوە... چونكە ئیتر لە (حي – هو) دوور دەبیت و دەچیتە دونیای (لا مكان)دوە..."

ئا بەم جۆرە مەولانا ڕووی مردنی جوان كردووە، ڕاستتر بڵێین ڕووی جوانی مردنی بینیوە و لەگەڵیدا ڕێككەوتننامەی مۆر كردووە. مردنی وا بینیوە كە ڕزگار بوونە لە دەردەسەرییەكانی دونیا و ڤیزەی گەیشتنە بە دۆستانی هەقیقی. خۆی لە ئەسڵدا ئەمە تێڕوانینی هەموومانە. چونكە بەپێی بیروباوەڕی ئیسلام، ڕۆح ئەبەدییە. مەرگیش دابڕینی ڕۆحە لە پۆشاكی جەستە.

یوونس ئەمرەش بە وتنی: "كە مەرگ دادێ، هەر لاشە ئەمرێ، ڕۆح قەت نامرێ" گوزارشتی لەم ڕاستییە كردووە. بەم باوەڕە، ڕووی ناوەوەی مردن ڕووناك دەبێتەوە. بەم جۆرەش مرۆڤی باوەڕدار ڕزگاری دەبێت لە ترسان لە مردن. ئەوانەش كە باوەڕیان بە نەمریی ڕۆح و ڕۆژی دوایی نییە، هەمیشە لەژێر باری تۆقین لە نەمانی ئەبەدیی دەتلێنەوە. ئەو ژیانەی دەیگوزەرێنن، لە ڕووی ماددییەوە

چـەنێك خـۆش بێـت، بـەهۆی ترسـی ئـەوەی کـە هەسـت دەکـەن مەحکوومی لەناو چوونن، هەرگیزا و هەرگیز ناتوانن دڵخۆش بن.

هەرچی مرۆڤە باوەڕدارەکانیشە، ئەوە لەم دونیایـەدا هـەر چـەنێك ئازار و ناڕەحەتی بچێژن، بەهۆی شەوقی ئـەو کامەرانییـە ئەبەدییـەی لە دەرگای بەهەشتەوە دەچنە ناوی، هەمیشە دڵشاد و ئاسوودەن.

***

## چەند بەڵگەیەك لەسەر بوونی ڕۆژی دوایی

یەکێك لەوانەی پرسیاری کرد، دووبارە پەنجەی بەرز کردەوە:

– ئەوانەی دەیـانڵێی، زۆر ڕاسـتن. بـاوەڕ بـوون بـە ڕۆژی دوایـی، مرۆڤ بەڕێژەیەکی بەرچاو لە ترسی مردن ڕزگار دەکـات. بـەڵام چـۆن بزانین ڕۆژی دوایی هەیە؟

گەنجێکی دیکە یەکسەر هەڵیدایێ:

– ئـەو بـرادەرە ڕاسـت دەکـات. کـێ چـووە بـۆ ڕۆژی دوایـی و گەڕاوەتەوە؟ هەر ئەوە بەس نییە بوترێ ڕۆژی دوایـی هەیـە. بـەر لـە هەر شتێك، دەبێ ئەم بانگەشەیە بێتە سەلماندن...

وتم:

– گەنجینە! ئێستا پرسیارێکی زۆر جـددیتان کـرد. ئـەم هـەویرە ئاو زۆر دەکێشێ و ناکرێ بە چەند ڕستەیەك وەڵام بدرێتـەوە. ئەگـەر

دوای ئەو هەموو ماندوێتییە، ئامادەیی ئەوەتان تێدابێ بە لایەنی کەم کاژێرێکی تر گوێم لێبگرن، ئەوە بۆتان ڕوون دەکەمەوە...

وتیان:

– ئەوەی ماندوو بووە و ئەوەش کە ئیشی هەیە با بڕوا، ئێمە دەمانەوێ بمێنینەوە و گوێ بگرین.

پشوویەکی کورتمان دا. دوای دە دەقە، سەیرم کرد دوو لەسەر سێی هۆڵەکە پڕ بوو... دیسان (بیسمیللا)م کردەوە و کەوتمە گێڕانەوە لە کتێبی (وتەکان)ەوە:

– سەرەتا با چاوێك لە مەکانەتی مرۆڤ و دونیا بکەین... ئەگەر بەباشی لە خۆمان و لەو دونیایەی تیایدا دەژین بگەین، ئەو کات لە ڕۆژی دواییش دەگەین.

ئایا دەشێ دونیا بێخاوەن بێت؟

ئەگەر دونیا بەڕاستی بێخاوەن بێت، ئەوە مرۆڤیش مافی ئەوەی هەیە بەو جۆرە بژی کە خۆی دەیەوێ.

بە چاو گێڕانێکی ڕووکەشانە، ڕەنگە دونیا وا بێتە بەرچاو کە بێخاوەن و سەربەخۆیە. ئا بەم بێفکرییە مرۆڤ خۆی بە تەواو سەربەخۆ دادەنێ و چۆنی بوێ ئاوا ڕەفتار دەکات.

بەڵام بیرکردنەوەیەکی کەمێك قووڵ و ڕوانینێکی هۆشیارانە، هەڵەیی ئەمە دەردەخات. دونیا شوێنێکە لەنێو هاوسەنگییەکی

سەراسیمەدایە و لێوان لێوە لە سیستەمگەلی بەیەکداچوو. ئەم هاوسەنگییە دەرئاسایە کە هێشتا ئەقڵی مرۆڤ نەیتوانیوە لێی تێبگا، ئایا دەشێ بێ کردگار بێت؟



وەك چۆن گوندێك بێ موختار و سوپایەك بێ فەرماندە و دەرزییەك بێ وەستا و پیتێك بێ نووسەر نابێ، ئەم دونیا کامڵ و مەزنەش بێ بەدیهێنەر نابێ.

ئینجا بەتوانایی و زانستی بێکۆتا و بەزەیی بێسنووری ئەم بەدیهێنەرە، لەو ڕێوشوێنانەی دەیانگرێتەبەر دەردەکەوێت.

بیرێك لە وەرزی بەهار بکەنەوە: وەك ئەو شەمەندەفەرانەی خۆراك دەگوازنەوە، بە بارێك بەرهەمەوە دێت. ئەو نیعمەتە بێ هاوتایانەی لەخۆ گرتووە کە مرۆڤ پێویستیی پێیانە. دێ بارەکەی دادەنێت و دەڕوا. ئایا ڕێی تێدەچێ ئەمە بێخاوەن بێ؟ ئەو ترێلە و شەمەندەفەرانەی پێویستییە سەرەکییەکانمانیان هەڵگرتووە و لە گونجاوترین کاتدا دەیانهێنن و هەڵیان دەڕێژنە بەر دەممان، ئایا دەکرێ بڵێین بێ خاوەنن و سەر بە کەس نین؟

ئەو ئاگادارییانەی لە هەموو شوێنێکدا هەڵدەواسرێن و ئەو مارکە و مۆرانەی لەسەر کاڵاکان دەدرێن و ئەو ئاڵایانەی لە گشت لایەك دەشەکێنەوە، خاوەنی ئەو شتانە بەئاشکرایی پیشان دەدەن. هەموو

بەرهەمێك، بوونی خاوەن بەرهەمەكە دەسەلمێنێ. وەك چۆن هەموو نیگارێك ئەو كەسە پیشان دەدا كە كێشاویەتی، ئاواش هەموو بوونەوەرێك بەدیهێنەری خۆی نومایان دەكات.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە پێكەوە سازان و یەكدی تەواو كردنی گشت بەدیهێنراوانیش تاك و تەنهایی بەدیهێنەرەكە دەردەخەن.

هەندێك كەس سەرەڕای ئەوەش كە لەم ڕاستییە تێدەگەن، ئاوا بیر دەكەنەوە:

" با یەكێك هەبێ، هەموو بوونەوەران خاوەنێكیان هەبێ... ئەگەر من لەم دونیایەدا وەك ئەوەی دەیخوازم سوود لەو زەنگینییانە وەربگرم كە ئەو بەدیهێناون، چ زیانێك بە گەنجینەی ئەو دەگات؟ خۆ ناشبینین ئەوانەی وەك خۆیان چۆنیان دەوێ ئاوا سوود لە گەنجینەی خاوەن موڵك و سامان وەردەگرن، هیچ جۆرە سزایەك بدرێن".

– بەڵێ، گەنجینەی ئەو زۆر پڕە و سوود وەرگرتنی تۆش لێی، هیچی لێكەم ناكاتەوە. وەلێ ئێرە واری خواردن و خواردنەوە و ڕابواردن نییە؛ بەڵكو گۆڕەپانی پەروەردە و فێربوونە. وەك پێشانگایەكە كە بەرهەمە پڕ لە هونەرەكانی ئەو خاوەن موڵك و سامانەی تێدا پیشان دراوە. میوانخانەیەكی كاتییە. ئەوەی دێ، زوو بەجێی دێڵێ و دەڕوا. شوێنێكە هەمیشە لە پڕ بوون و بەتاڵ بوونەوەدایە.

پاشی ماوەیەك، ئەم مەملەكەتە گۆڕانی بەسەردا دێت. ئەو خەڵكە بۆ شوێنێكی دیكەی هەمیشەیی دەگوازرێنەوە. ئیتر لەوێدا هەر كەسە و بەپێی ئەوەی لە دونیادا كردوویەتی، پاداشت یانیش سزا وەردەگرێت.

لەم ڕوانگەیەوە كات بەسەربردن لێرە بە ڕابواردن و كاری نابەجێ، هەڵەیەكی گەورەیە. هەق وایە هەوڵ بدرێ كاری پێویست بۆ ئەو مەملەكەتە ئەسڵییە بكرێ كە بۆی دەچین. چونكە ئەوێ، بۆ ئەو كەسانەی كە بەپێی ویستی خاوەن میوانخانەكە جووڵاونەتەوە، شوێنی بەختەوەریی نەبڕاوەیە. بۆ ئەوانەش كە میوانخانەكەیان بە خانەیەكی ئەبەدیی داناوە و توێشوویان بۆ ئەولایان كۆ نەكردووەتەوە، شوێنی سزای هەمیشەییە.

گەنجەكان بەجۆشەوە گوێیان بۆ ڕادێرابووم. بەڵام ئۆقرەیان لێهەڵگیرابوو، وا دیار بوو وەڵامی پێویستیان بۆ پرسیارەكانیان چنگ نەكەوتبوو.

وتیان:

"– بەڵام مامۆستا ! ئەوانەی باست كردن، ئەوە ناسەلمێنن كە پەسڵان بوونی هەبێ. چۆن ئەوەمان بۆ ڕوون دەكەیتەوە كە ڕۆژێك ئەم دونیایە تێك دەدرێت و ئێمەش بارگە و بنەمان بۆ شوێنێكی تر دەگوازینەوە؟"

– هەقتانە... ئێستا هەوڵ دەدەم وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە کە چۆن دەتوانین بە ئاوەزمان لەوە بگەین ڕۆژی دوایی بوونی هەیە:

## نابێ چاکە بێ خەڵات و خراپەش بێ سزا بمێنێتەوە

١– بەدیهێنەری و سەڵتەنەتی مەزنی خودای گەورەمان لەم دونیایەدا ڕوون کردەوە. ئێستا بیر بکەنەوە... ئایا پێویست ناکات پاداشتی



ئەوانە بدرێتەوە کە بەپێی فەرمانی ئەو سوڵتانە مەزنە جووڵاونەتەوە و سزای ئەوانەش بدرێ کە بێ فەرمانییان کردووە؟

ئەگەر بێت و چاکەکان خەڵات نەکرێن و خراپەکانیش سزا نەدرێن، ئەوە دەکا مامەڵەیەکی دادگەرانە نەکراوە. ئەمە لە کاتێکدا کە خودای گەورە خاوەن دادگەرییەکی بێوێنەیە.

کەچی لەم دونیایەدا، زۆر جار دادگەریی بەرجەستە نابێ. هەندێ جار مرۆڤە باشەکان ڕیسوا و خراپەکانیش پاداشت دەکرێن یان ئەوەی کردوویانە بەسەریاندا تێدەپەڕێ. کە وا بوو، پێویستە لە

شـوێنێکی تـردا دادگایـەکی گـەورە هـەبێ کـە بەتـەواوی دادی تێـدا بەرجەستە ببێ.

ئیتر ئـەم دادگـا گەورەیـە هـەقی هـەموو خـاوەن هـەقێك دەدات و نایەڵێت هەقی کەس لەسەر کەس بمێنێتەوە.

بەڵێ، شوێنی ئەو دادگا گەورەیەش، ڕۆژی دواییە.

## دەبێ هەق جێی خۆی بگرێ

٢- خودای گەورە خاوەنی سـۆز و بەزەییـەکی بێکۆتایـە. بـەڵام لـەم دونیایـەدا، تەنانـەت یـەك لـە هـەزاری ئـەو ئەنجامانـەی لـەو سـۆز و بەزەییــە دەوەشـێنەوە، بەدینایــەن. زۆر جـار، سـتەمکاران لــەنێو ســەروەت و ســاماندان، ســتەملێکراوانیش بەدەســت نەبوونییــەوە دەناڵێنن و بەئازارەوە سەر دەنێنەوە.

کەواتە سکاڵاکان بۆ دادگایەکی دیکەی گەورە دەهێڵرێنەوە.

٣- سەڵتەنەتێکی بەهێز، دەخوازێ پارێزگاریی لەوانە بکا کـە پـەنای بۆ دەهێنن. عەدالەتیش ئەوە پێویسـت دەکـات کـە مافـەکانی خـەڵك پارێزگارییان لێبکرێت. تەنها بەم جۆرە شکۆی دەسەڵات و حیشمەتی سەڵتەنەت پارێزراو دەبێت.

خودای گەورەش کە فەرمانڕەوای ڕاسـتەقینەی ئـەم گەردوونەیـە، بۆ هێنانەدیی ئەم ئەنجامانە، ڕۆژی دوایی داناوە.

## ناكرێ جوانییەكان بێ تەماشاكەر بن

٤- خـــودای گـــەورە خـــاوەنی جوانییـــەكی بێهاوشـــێوەیە. گشـــت جوانییەكان، ڕەنگ دانەوەی سیفەتە جوانەكانی ئەون، ئەمـەش دوای ئەوەی بە چەندان پەردەدا تێدەپەڕن.

ئەگەر بەوردی لەو ژینوارە بڕوانین كە تێیدا دەژین، دەبینین گشت بوونەوەران هەواڵی ئەم جوانییە سەراسیمەیە دەگەیەنن. هـەر شـتێك كە هەیە، جاڕدەر و وەرگێڕی جوانییەكی شاراوەیە. چونكە ئەوەنـدە ڕێك و پڕ مانایە كە ڕێی تێناچێ بەڕێككـەوت بووبێـت. تـەنها دەكـرێ جێدەسـتی بەدیهێنـەرێكی بێهاوتـا بێـت. كـەماڵ و گـەورەیی بـێ هاوشێوەی ئەو پیشان دەدەن، جوانیی بێ وێنەی ئەو نمایش دەكەن كە سەرچاوەی گشت جوانییەكانـە.



هـــەواڵی تـــام و چـــێژی مەعنـــەویی جوانییە شاراوەكان دەگەیەنن.

سەرچـاوە و خـاوەنی هـەقیقیی گشـــت ئـــەو كەماڵانـــەی شـــایانی پێـــزانینن و هـــەموو ئـــەو خۆشەویســـتییانەی كـــە خۆشەویستیی و سەرسامیی بەئاگا دێنن، خودای گەورەیە.

جوانیی و کەماڵی بێ کەموکوڕیی شاراوەش، پێویستی بەوەیە پیشانی کەسانێك بدرێ لێی تێبگەن. دەخوازێ لە ئاوێنەی جیا جیادا بێتە بینەران و تەماشاکارانی تووشی سەرسامیی بکات. چونکە جوانییەکی هەتاهەتایی، حەز بەوە دەکات بوونی تەماشاکارە عاشقەکانیش بەردەوام بێت. وەك چۆن جوانییەکە درێژەی هەیە، ئاواش پێویست دەکات بوونی ئەوانەی پێی دەزانن و لێی تێدەگەن، درێژەیان هەبێت.

ئا لەبەرئەمە، بۆ ئەوانەی کە هەقی تەماشا کردنی جوانیی ئیلاهی بەدەست دەهێنن، بەهەشتێکی هەتاهەتایی بەدیهێنراوە.

## بەخشندەیی بێ کۆتای خودا،

## بوونی ڕۆژی دوایی پێویست دەکات

٥- زۆر و زەوەندیی نیعمەتەکانی دونیا، ئەوە پیشان دەدات کە خودای گەورە بەخشندەیی و گەنجینەیەکی بێ سنووری هەیە. ئەم گەنجینە و بەخشندەییە بێ سنوورەش، ئەوە پێویست دەکات کە هەم بەردەوام بێت و هەمیش میوانخانەیەك هەبێت کە هەموو شتێك لەخۆبگرێت.

هەر ئەوە پێویست ناکات کە میوانخانەکە بەردەوامیی هەبێت، بەڵکو ئەوەش پێویست دەکات کە ئەوانەی لەوێ چێژ وەردەگرن، بۆ

هەمیشەیی لەوێ بمێننەوە. تا لەو دونیایەدا بەهۆی لەدەستدانی ئەو شتەی کەمێك تامیان کردووە، خەم و داخ نەخۆن. چونکە نەمان و بڕانەوەی تام، تاڵییە.

ئەم نیعمەتە جۆربەجۆرە بێشومارانە ئەوە پیشان دەدەن کە ئەوەی لە جامخانەی دونیادا بینیومانە، تەنها نموونەگەلێکن. ئەسڵە بێ کۆتاکانیان لە شوێنێکی دیکەدان.

## دونیا شوێنی تام کردن و

## ڕۆژی دواییش شوێنی تێر بوونە

٦- جوانییەکی هەتاهەتایی، بە عاشقانێك کە بێن و بڕۆن ڕازی نابێت. چونکە ئەوینی عاشقێك کە مەحکوومی ڕۆیشتنی بێگەڕانەوە و ون بوون و مردنە، دەگۆڕێت بۆ دوژمنایەتی. ئەمەش لەبەرئەوەی بیر لە کۆتاکەی دەکاتەوە و تێدەگات لەوەی لە ماوەیەکی کەمدا ئەم جوانییانە بۆ هەتا هەتایە لەدەست دەدات.

ئەمەش لە کاتێکدایە کە هەموو کەسێك لەم میوانخانەی دونیایەدا زوو دێ و زوو دەڕوا. بۆ چرکەساتێك سەیری تیشکۆکەیەکی ناو و سیفەتە جوانەکانی خودای گەورە دەکات و بێئەوەی لێیان تێر بێت، دەڕوات.

کەواتە خۆشییەکانی ئەم دونیایە کە تەنها بایی تام کردنن نەك لێ تێر بوون، بوونی دونیایەکی دیکە دەردەخەن کە جوانیی ئەبەدیی نمایش دەکات.

لەمەوە تێدەگەین کە ئێمە لەم دونیا فانییەوە دەچین بۆ دونیایەکی باقیی، کە بە جۆرێك تێیدا دەژین، تێر دەبین لە جوانییە نەمرەکانی.



## نزای مانەوە

٧- ئەم دونیایە سۆزی بێ کۆتایی خودای گەورە پیشان دەدات. ئەو خودایەی دەرمان بۆ دەردی گشت دەردەدارێك دەنێرێت. دەوا و شیفا بۆ نەخۆشییەکان فەراهەم دێنێت. تەنانەت بچووکترین و سادەترین داخوازییەکان، بێ وەڵام ناهێڵێتەوە. بۆ نموونە: ئەو دوعایەی گەدەمان لەدەست برسێتی دەیکات، بە هەزار جۆرە خواردن و خواردنەوە بە دەمییەوە دەچێت.

ئێستا ئایا ئەو خودایەی کە بە سۆزێکی زۆرەوە گشت جۆرە پێویستییەکانی چی بوونەوەر هەیە دابین دەکات، گرنگترین دوعای خۆشەویستترین بەندەی، کە زۆر دووبارەی کردووەتەوە و زۆر بەپەرۆشییەوە داوای کردووە، ناهێنێتە جێ؟

پێغەمبەر ﷺ هەم بۆ خۆی و هەمیش بۆ ئوممەتەکەی داوای بەختەوەریی هەتاهەتایی کردووە، داوای بەهەشتی نەبڕاوەی کردووە.

خۆی لە خۆیدا ئەم داواکاری و پاڕانەوەیە، ئاواتی هەموو کەسێکە. ئینجا ویستی خودای گەورەشە، چونکە "پێدانی نەویستایە، ویستنی نەدەدا".

ڕەحمی بێ کۆتا و دادی بێ سنووریشی، هەر ئەمە پێویست دەکات. ئینجا بەدیهێنانی دونیای ئاخیرەتیش لە ئاست دەسەڵاتی ئەودا، زۆر ئاسانە. تەنها وتنی "کُنْ – ببە!"ی ئەو، بەسە بۆ بەدیهاتنی بەهەشت. خودایەك ئەوەندە گرنگیی بە جوانییەکانی ئەم جامخانە کاتییە دابێت کە پێی دەوترێ دونیا، مەگەر گەنجینە هەقیقی و هونەرە ڕەسەنەکانی، لە جیهانی ڕۆژی دواییدا و بە جوانترین شێوەش کە ئەقڵەکان بە دۆشدا بێنێ، نمایش ناکات؟

کەواتە ئەوانەی لەم گۆڕەپانی تاقیکردنەوەیەدا دەژین، هەر وا و بێهودە بەدینەهێنراون... یان کۆشکەکانی بەختەوەریی یانیش زیندانەکانی سزا چاوەڕوانیانن.

## دونیا نشینگە نییە، میوانخانەیە

٨- ئەو ڕێکوپێکییەی دونیا کە ئەقڵ نایبڕێ، ئەوە پیشان دەدات کە لەو دیوی پەردەوە، دەسەڵاتێکی مەزن بوونی هەیە. دەسەڵاتێك کە بەردەوام لە حوکمڕانیدایە. دەسەڵاتێکی لەو جۆرەش پێویستی بە مرۆڤگەلێکی شایان بە خۆی هەیە. ئەمە لە کاتێکدا کە مرۆڤەکان لە میوانخانەیەك کۆبوونەتەوە کە بەردەوام لە پڕ بوون و بەتاڵ بوونەوەدایە. ئەم میوانخانەیە بە شێوەیەك ڕێك خراوە کە جێی پەروەردە و پێگەیاندن بێت... هیچ شتێك وەك خۆی نامێنێتەوە، هەر بۆیە گۆڕەپانەکە هەموو سەعاتێك گۆڕانکاریی تێدا دەکرێت.

مرۆڤەکان بۆ ئەوەی سەیری نموونەی ئیحسانەکانی ئەو فەرمانڕەوایە و دەستڕەنگینییە سەرسوڕهێنەرەکانی بکەن، زۆر کەم لەم پێشانگایەدا دەمێننەوە. پێشانگاش هەمیشە گۆڕانی بەسەردا دێت... ئەوەی دێ دەڕواتەوە، ئەوەشی دەڕوات نایاتەوە.

ئەمەش ئەوە دەردەخات کە بەدڵنیاییەوە لەو دیوی ئەم میوانخانەیەدا، نشینگە و کۆشکی هەمیشەیی و باخ و باخات و گەنجینەگەلێك هەن کە پڕن لە نموونەی ئەسڵیی ئەم نموونە و دیمەنانە.

کەواتە هەوڵدانی ئێرە، بۆ ئەوێیە. لێرە کار دەکرێ و لەوێ کرێ وەردەگیرێ. هەر کەسە و بەقەد لێهاتوویی و ماندوویی ئێرەی، لەوێ بەختەوەریی دەست دەکەوێت.

## هەموو شتێك تۆمار دەکرێت

٩- ئادەمیزاد بە سوود وەرگرتن لە پێشکەوتنە زانستییەکان، هەموو شتێك دەنووسێتەوە و تۆماریان دەکات. هەندێ جار شتانی زۆر بێبایەخیش لەڕێی ڕیکۆردەر و کامێرای فۆتۆ و ڤیدیۆییەوە تۆمار دەکات و لە کۆمپیوتەردا خەزنی دەکات.

خودای گەورە کە خاوەنی هەقیقیی ئەم جیهانەیە، خواستی وا بووە کە هەر چییەك لە موڵکەکەیدا ڕوو دەدات، تۆمار بکرێت و لەبیر نەکرێت. بێگومان هێزی بێکۆتایی ئەو، تۆمارکرانی هەموو شتێك مسۆگەر دەکات. ئەوەتا مرۆڤیش بەو زانستە سنووردارەیەوە کە هەیەتی، دەتوانێ زۆر شت ئەرشیف بکات.

بەو پێیەی خودای گەورە داوای کردووە هەموو شتێك تۆمار بکرێت، مانای وایە دەیانخاتە لیستەوە. خستنە لیستی شمەکێکیش بەبەردەوامی، ئەوە دەگەیەنێت کە حیساب و کیتابی بۆ دەکرێت. حیسابات هەبێت، ئەوا پاداشت و سزا دانیش هەیە. کەچی دەبینین

لەم دونیایەدا نە ئەوانەی شایانی سزان سزای پێویست وەردەگرن، نە چاکەکانیش وەك ئەوەی شایانین، پاداشت وەردەگرن...

کە وا بوو، ئەوکات ئەم کردارە، لە دونیایەکی تردا دێتە دی.

کە قسەکانم بەمە گەیشت، ئەو گەنجەی پرسیارەکەی کرد، دیسانەوە پەنجەی بەرز کردەوە:

- ببوورە، مامۆستا گیان! چۆن دەتوانیت ئەوەمان بۆ ڕوون بکەیتەوە کە هەموو شتێکی ئەم دونیایە دێتە تۆمار کردن. دەتوانیت نموونەی بەرجەستمان لەسەر ئەم بابەتە بۆ بێنیتەوە؟

- بۆ نا؟!... سەیر بکەن، مرۆڤ خاوەن یادگەیە، واتە هێزی لەبەر کردنی هەیە. لەڕێی ئەو فرمانەی مێشکمانەوە، هەزاران شت تۆمار دەکەین و لە کاتی پێویستیشدا بەبیری خۆمانی دێنینەوە. گشت بوونی درەختەکان لە تۆوە بچووکەکانیان و پوختەی میوەکانیش لە ناوکەکانیاندا هەیە.

ئەم نموونانە کە لە دونیادا دەیانبینین، بۆمان دەسەلمێنن کە گشت ئەو شتانەی ڕوو دەدەن، دێنە تۆمارکردن.

ئەو شوێنەی لای خودا کە هەموو شتێکی ئەم دونیایەی تێدا تۆمار دەکرێت، (اللوح المحفوظ)ی ناوە. ئەمە گەورەترین میمۆرییە کە هەموو شتێکی لەناودا جێ دەبێتەوە.

مەگەر ئەركی فریشتەكانی (كِراماً كاتبين)یش تۆمار كردنی كارە چاك و خراپەكانی خەڵكی نییە؟

ئێستا زانستی سەردەم گەیشتووەتە ئەو قەناعەتەی كە هیچ دەنگێك ون نابێت. تەنانەت وا بەشوێن ئەوەوەن ئامێرێك دروست بكەن، ئەو قسانەی لە ڕابردوودا كراون، تۆماریان بكەنەوە.

## پێشانگاكان بۆ ناساندنی هونەرمەندان و پیشاندانی هونەرەكانیان دەكرێنەوە

١٠- لەم دونیایەدا هەموو شتێك لە گۆڕاندایە. هەموو ساتێك لە ناو گۆڕانكاریدا دەژین. هەر تازەگەری و گۆڕانێكیش، بەپێی خۆی جوانی لەخۆ دەگرێت. ئەو گۆڕانانەی لەگەڵ وەرزەكاندا دێن، گۆڕانكارییە جەستەیی و ڕۆحییەكانی مرۆڤ، هەر دەم بەردەوامییان هەیە. ئا ئەم جوانییە هەردەم گۆڕاوانە، بۆ ئەوە نین چركەساتێك تەماشا بكرێن. ئەگەر وا بوایە، ئەوە حەیف دەبوو بۆ ئەو بەرهەمە جوانانە. بۆ؟ بیر لە نیگاركێشێك بكەنەوە. ئایا نیگارێكی جوان و سەرنج ڕاكێشی خۆی تەنها لە پێشانگایەك پیشان دەدا و پاشان تێكی بدات و فڕێی بداتە زبڵدانەوە؟

بێگومان نیگارکێشێك ئەقڵی لە مێشکیدا بێت، حەز دەکات ئەو شاکارەی لە شوێنێکی باشتر، لە مۆزەخانەیەکی گەورە کە زۆر بمێنێتەوە و هونەر دۆستان بەردەوام بێن تەماشای بکەن، دابنێت.

ئینجا بۆ ئەوەی ئەو پێشانگا کاتییانە بکرێنە یادگارییەك و زیاتر بمێننەوە، وێنەیان دەگیرێت دەکرێن بە فیلم.

مانای وایە مرۆڤەکان هەوڵی ئەوە دەدەن بەرهەمەکانیان لە کاتی بوون دەربێنن و بیکەن بە شتێك بمێنێتەوە.

ئا وەك ئەوەی نێو ئەم نموونەیە، خودای گەورەش جوانییەکانی ئەم دونیایە، دوای ئەوەی بۆ ماوەیەکی کورت دێنە تەماشا کردن، فڕێیان ناداتە عەدەمەوە و نابێتە ڕێگەخۆشکەر بۆ ئیسرافێکی ئاوا گەورە. بەڵکو پارێزگاریی لە یادگاریی جوانییە بێ وێنەکانی ئێرە دەکات و لە پێشانگایەکی گەلێك گەورەتردا بۆ هەتا هەتایە دەیهێڵێتەوە.

ئەم جیهانەش کە تێیدا دەژین، دەخرێتە سەر شێوەیەکی تر و لە شوێنێکی تردا سەرلەنوێ و بەشێوەیەکی زۆر جوان و مانادارتر دادەمەزرێنرێتەوە.

ئەم ڕاستییەش، بوونی ڕۆژی دوایی دەسەلمێنێت.

## لێرە بایی تام کردن دەدرێ و لەوێش پێشکەش دەکرێ

١١- بیر لە پاشایەك بکەنەوە. ئەم پاشایە چەندین نیعمەتی جوان جوان بە گەداکانی ژێردەستەی پیشان دەدات و بگرە ڕێیان دەدات تامیشیان بکەن، وەلێ لێناگەڕێ تێر بخۆن لێی. جارێکی تریش ئەو نیعمەتانەیان پیشان ناداتەوە.

ئایا شایەکی وا، زاڵم نییە؟ بە ستەمکار دانانرێ؟

خودای گەورە لەم دونیایەدا تامی گەلێك نیعمەت بە بەندەکانی دەچێژێ. بەڵام ژیانی کورتی دونیا، زوو دەڕوا و دەبڕێتەوە. هیچ کەسێك، جا چەندیش تەمەنێکی درێژ بەسەر ببا، هەر لە ژیان تێر نابێت. ئەمە لە کاتێکدایە کە خودا بەڕەحمترینی بەڕەحمەکانە و دادگەریشە. بەڵام ئەم ڕەحمەت و دادگەرییەی خوا گیان، لەم دونیایەدا وەك پێویست دەرناکەوێت.

لەمەوە تێدەگەین، ئەوەی لێرە دەیەڵێت تامی بکەین، لە جیهانێکی تردا بە چەشنێك پێمانی دەبەخشێت کە بتوانین تێری لێبخۆین.

## نموونەکانی ژیانەوەی دوای مردن

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموویت: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَ نَبْلُوكُمْ بِالشَّرِّ وَ الْخَيْرِ فِتْنَةً و إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾ — الأنبياء:٣٥،

واتە: "هەموو کەسێك مردن دەچێژێت. ئێمە بە شەڕ و ناخۆشی و خێر و خۆشی تاقیتان دەکەینەوە. سەرەنجامیش هەر بۆ لای ئێمە دەگەڕێنرێنەوە".

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموویت: "إِنَّمَا الْقَبْرُ رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ أَوْ حُفْرَةٌ مِنْ حُفَرِ النَّارِ" واتە: "گۆڕ یان باخێکە لە باخەکانی بەهەشت، یانیش چاڵێکە لە چاڵەکانی دۆزەخ".

بەڵام لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا زۆر کەس هەیە حەز دەکات بە بەڵگەی ئەقڵی ژیانەوەی دوای مردنی بۆ ڕوون ببێتەوە. بۆیە پێویستمان بە گەلێك نموونەی جۆراوجۆرە باوەڕ بە ڕۆژی دوایی بخاتە مێشکمانەوە.

لەم ژیانەی تێیدا دەژین، زۆر نموونەی سەرنج ڕاکێشی ژیانەوەی دوای مردن هەیە:

١- سەرەتا با بیر لە نان بکەینەوە کە سەرەکیترین خۆراکمانە... گەنم کە ماددەی خامی نانە، کە زەرد دەبێت، دەدوورڕێتەوە. ئەمە مردنێکە بۆ گەنم... دەبرێت بۆ ئاش، دەهاڕێ و دەکرێ بە ئارد. ئەمەش دووەم مردنە. پاشان لەگەڵ ئاودا تێکەڵ دەکرێت و جوان جوان دەشێلرێت و دەکرێت بە هەویر. پاشان لە تەنووردا دەبرژێنرێت. ئەمەش مردنێکی ترە بۆ گەنم. ئینجا دەهێنرێتە سەر خوان و بۆ دەم دەبرێت، دەجاورێت و وایلێدێت نەناسرێتەوە. ئەمەش

جۆرە مردنێکی دیکەی گەنمە. دوا جار شۆڕ دەکرێتەوە گەدە و لەگەڵ جۆرەها شلە تێکەڵ دەکرێت و مردنێکی دیکە دەچێژێت. گەنم وای لێدێ لە گۆڕستانی گەدەدا دێتە ڤەشارتن. لەکاتێکدا وای لێدێ، بڵێی ئیدی تەواو جارێکی تر ناتوانێ بژێتەوە، لە گەدەوە دادەبەزێتە ریخۆڵەکانەوە. لەوێشدا لەڕێی موولوولەکانی خوێنەوە دێتە مژین و بۆ ئەندامەکانی جەستە ڕەوانە دەکرێت.

تیکە نانێك دوای ئەو هەموو مردنەی بەسەریدا دێ و لە گۆڕستانی گەدەشدا دەنێژرێت، دیسان بە شێوەیەکی زۆر بەنرختر و زیندووتر دەژێتەوە. لە چاوەکانماندا وەك ڕووناکی و لە ماسوولکەکانماندا وەك هێز و لە قامکەکانی دەستیشماندا وەك نینۆك درێژە بە بوونی خۆی دەدات.

چما مرۆڤ لە پاروە نانێك بێنرخترە، تا دوای لە گۆڕ نرانی، خودای گەورە سەرلەنوێ زیندووی نەکاتەوە؟

٢- ئەو تۆوانەی دەخرێنە ژێر گڵەوە، لە کاتێکدا کە وا دادەنرێن مردن، ڕزین، لەناو چوون، دووبارە زیندوو دەبنەوە. لە ژیانێکی نوێدا سەر دەردێننەوە کە تێیدا گەلێك لە جاران زۆرتر و جوانترن. بە یەکی دەمرن و بە هەزار زیندوو دەبنەوە. جا هەر یەکە و بەپێی پێکهاتەی خۆی: یەکێك وەك گوڵەباخ، یەکێك وەك قەرەنفڵ و هی وایشی هەیە وەك حوشترمشك و کاکتوس دونیاکەمان دەڕازێننەوە.



ئایا مرۆڤ لای خودای گەورە لە ڕووەکێك بێنرخترە، تا ئەو مرۆڤانەی دەخرێنە ژێر گڵ زیندوو نەکرێنەوە؟

لە دووبارە گەڕانەوەی تۆوێکدا بۆ ژیان، قودرەتی بێکۆتای پەروەردگارمان بەڕوونی بۆ دەردەکەوێت.

چونکە تۆو نەفامە. گڵیش سەری لە هیچ دەرناچێ. تۆوێکی نەفام، دەکەوێتە ناو گڵێکی نەزانەوە. خاك لەباوەشی دەگرێت، چونکە بەو جۆرە فەرمانی بەسەردا دراوە.

تۆو بێخەبەرە لەو پرۆگرامەی لە ناخیدا شارراوەتەوە، خاکیش ئاگای لەو شتانە نییە کە دەیانبەخشێتە تۆوەکە...

پاشانیش ئەو هەورانەی بێبەهرەن لە ئەقڵ و ئیرادە، بە فەرمانی ئیرادەیەکی لێوان لێو لە سۆز و بەزەیی، دەستیان بۆ درێژ دەکات. ئەو ئاوەی ئاتاجیان پێیەتی، دەیگەیەنێت پێیان، ئینجا ڕێك لە کاتی خۆیشیدا...

جوانییەکی وا لەم سێ شتە نەزانە دێتە ئاراوە، هەر مەگەر بە کۆبوونەوەی چەند زانستێك ئینجا لێی تێبگەین...



ڕێککارییـــــەکی بێهاوشـــــان و هاوســـەنگییەکی زۆر ورد دەکەوێتـــە کار. بۆ ئـەوەی تۆوەکـە بتـوانێ وەك چـرۆیەك لــە خــاك ســەر دەربـێنێ، پێویســـتی بەوەیـــە بەپێچـــەوانەی ئاراستەی هێـزی کـێش کردنـی زەوی گەشە بکات. ئەمەش دێتە جێ. ئەو هیچ نەزانانە وەك ئەوەی سەریان لە چەقی زەوی و هێزی کێشانەکەی دەربچێت، خۆڕاگریی دەکـەن تـا ئەوەی بە ئاڕاستەکەی تردا سەر لە خۆڵەکە دەردێنن...

٣- ئەو درەختانەی بە پایزان گەڵاکانیان دەوەرێـنن و کـە زسـتانیش دادێ دەبنە دارێکی ڕەش داگەڕاو بەم جۆردش وا دادەنـرێ مـردوون، لەگەڵ بەهاردا دەگەڕێنەوە بۆ ژیان و گیانیان بەبەردا دێتەوە.

ئـەو ئاژەڵانـەی لـە زسـتاندا لـەژێر زەوی مـت دەبـن، لـە بـەهاردا دیسـانەوە دەگەڕێنـەوە بـۆ ژیـانی سـەر زەوییـان... مـرۆڤیش دوای خەزانی مەرگ، دیسان دەگاتەوە بە بەهاری ژیان.

٤- وتراوە: "خەوتن برا بچووکی مردنە". ئێمە هەموو شـەوێك، بـرای بچـووکی مــەرگ دەچـێژین. دەچـینە پێخەفمانــەوە و لێفـە بـەخۆدا دەدەین. دەزانین لە خەوی شەومانەوە دەگەین بە بێداریی بـەیانمان.



لــیٚ لــە خــەودا، وەك مــــردوو وایـــــن. زۆر جـاریش لـە دونیاگـەلی تـردا پیاسـە دەکـەین. مردنیش وەك خـەوێکی دوور و درێـــــژە کــــە پێخەفەکەی گۆڕە.

هەموو شەوێك بەیانییەك و هـەموو زسـتانێکیش بـەهارێکی هەیـە. وەك چۆن لە هەموو بەیانییەکدا چاو بـۆ رۆژێکـی نـویٚ دەکەینـەوە، ئاواش لە دوای مردن – کە برا گەورەی خـەوە– بـۆ دونیایـەکی نـویٚ بەئاگا دێین.

کـە قسـە بەمـە گەیشـت، بینـیم (جونەیـدی فەیلەسـووف) داوای مۆڵەتی قسە دەکات:

– مامۆستا ! لە کاتێکدا خـەوتن و مـردن دوو خزمـی ئاوا نزیکـی یەکدین، بۆچـی مـرۆڤ بـرا بچووکەکەی خـۆش دەوێـت و خۆشـیی لـە کاکی نایەت؟

ئــەم پرسـیارە بــەدڵی پـۆل بــوو. پێدەکـەنین. دیـار بـوو ئــەوە پرسیارێك بوو دەربڕی هەستی هەموویان بوو...

– بەڵێ، جونەید! ئەوەی دەیڵێیت ڕاستە... بەشێوەیەکی گشتی لەبەرئەوەی مرۆڤەکان پەی بە ڕووی ناوەوەی مەرگ نابەن، ئاوا بیردەکەنەوە. ئێستا کە ئاوا بەدرێژیی باسی زیندوو بوونەوەی دوای مردن دەکەم، بۆ ئەوەمە بتوانین برا گەورەی خەوتنیشمان خۆشبوێت.

ئێ خۆ پیاوە گەورەو دڵ بێدار و ڕۆح پاکەکان لە مردن نەترساون و بگرە بە دەمی بە خەندەوە خۆیان ڕادەستی کردووە.

٥– بچووکترین پێکهاتەی پێکهێنەری جەستەمان، خانەیە. لە کاتێکدا کە بەشێکی ئەم خانانە لە دروست بووندان، بەشێکی دیکەیان لە مردنبدان. بۆ نموونە: خانەکانی پێستمان؛ ساڵانە سەرلەبەریان نوێ دەبنەوە.

خڕۆکە سوور و سپییەکانی خوێنیشمان هەروان. هەزارانیان دەمرن و هەزارانی تریشیان زیندوو دەبنەوە. بەم شێوەیە جەستەمان دەبێ بە گۆڕستانێکی گەورە. لەمەوە دەبینین کە پێکهاتەی خودی خۆمان زیندووترین نموونەی مردن و زیندوو بوونەوەیە.

٦– ئەگەر ڕێی تێچووایە بۆ ئەو کۆرپەلەیەی هێشتا لە سکی دایکیدایە و لەدایک نەبووە، باسی ئەم دونیایە بکرایە و بوترایە زۆر لە شوێنەکەی خۆت گەورەتر و فراوانتر و خۆشترە، دەبوایە چەنێك باوەڕی بکردایە؟

ئایا ئەو جووجەڵەیەی لە هێلکەدایە دەتوانێ لەو دونیایە تێبگا کە پاشی کەمێك بۆی دەردەچێت؟ ئەو ئادەمیزادانەش کە لەم دونیایەدا دەژین حاڵیان ئەوەندە جیاواز نییە لەمانە. ئەم دونیایەش وەك هێلکەیەك وایە کە مرۆڤی لەناودا دەژی. پێی وایە دونیاکەی تێکبچێ، ئیتر جیهانێکی تر نییە. ئەمە لە کاتێکدا، کە ئەم دونیایە بەچاو ڕۆژی دوایی هەر بەقەد هێلکەیەکە.

٧- لە سەردەمی پێغەمبەریشدا ﷺ، کەسانێك هەبوونە باوەڕیان بە ژیانی دوای مردن نەبووە. ڕۆژێك (ئوبەی کوڕی خەلەف) ئێسکێکی ڕزیوی بەدەستەوە دەبێت و دەچێتە لای حەزرەتﷺ. ئێسکەکەی دەستی ورد ورد دەکات و دەپرسێ:

" خودای گەورە جارێکی تر ژیان بەبەر ئەم ئێسکەدا دەکاتەوە، وا نییە؟"

پێغەمبەریش ﷺ بەم جۆرە وەڵامی دەداتەوە:

" بەڵێ، هەم ژیان بەو دەبەخشێتەوە و هەمیش تۆ دەخاتە دۆزەخەکەیەوە! "

ئا لەسەر ئەم ڕووداوەیە ئایەتی ٧٨ و ٧٩ی سوورەتی (یاسین) نازڵ بووە:

﴿وَ ضَرَبَ لَنَا مَثَلاً وَ نَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِ الْعِظَامَ وَ هِيَ رَمِيمٌ * قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ - واتە: "بەدیهێنرانی خۆی بیر

چووەتەوە و هاتووە نموونـەمان بـۆ دێنێتـەوە کـە کـێ ئێسـکی ڕزیـو زیندوو دەکاتەوە؟ بڵێ: کێ یەکەم جار بەدیهێناوە، هەر ئەو زیندووی دەکاتەوە".

٨- کە قیامـەت دادێ، زینـدوو کردنـەوەی گشـت مرۆڤـەکان لـە یـەك سـات و پێکـەوە دەبێـت. هەنـدێك کـەس لـەم ڕاسـتییە تێناگـەن کـە قورئان بەیانی کردووە، بۆیە دەپرسن: "چۆن گشـت ئەمانـە لـە یـەك ساتدا دەخرێنەوە جەستە، گشت مردووەکـان چـۆن لـە پـڕدا زینـدوو دەکرێنەوە؟"

تێگەیشتن لەمە بە نموونەیەك ئاسانە. بیر لە سوپایەکی ڕێك و بـە تەنزیم بکەنەوە... با بڵێین گشت ئەو سەربازانەی سەر بەم سوپایەن، لـەنێو مەشـقدا پشـوویان پێـدراوە و هـەر یەکـە و بـۆ لایـەك چـووە و پەرش و بڵاوبوونەتەوە... ئایا کۆ کردنەوەی گشت ئەم سەربازانە بـۆ فەرماندەی سوپاکە زەحمەتە؟

ڕێك بەپێچەوانەوە، دەتوانێت سەربازە پەرش و بڵاوەبووەکان بـێ هیچ زەحمەتییەك و بە دەنگی کەڕەنایەك کۆ بکاتـەوە و بیانخاتـەوە سەر تەنزیماتەکەی پێشوو.

ڕۆحـەکانیش کـە گـەلێك لــە ســەربازانی ســوپایەك گوێڕایـەڵتر و بەتەنزیمترن، بە یەك بانگەوازی خـودایی دەمودەسـت دەچـنەوە نێـو جەستەکانیان.

زیندووکردنەوەی گشت جەستەکانیش لە یەك چرکەساتدا، وەك ڕووناك کردنەوەی شارێك و بگرە سەرتاپای دونیایە بە پەنجە پێدانانە دوگمەیەکەوە.



وەك چۆن لە وەرزی بەهاردا، لە یەك ڕۆژدا گەڵاکان کە بە ژمارە گەلێك لە مرۆڤەکان زیاترن، سەوز دەبن و گوڵانیش دەکرێنەوە، گشت مرۆڤەکانیش ئاوا لە پەسڵاندا بە یەك جار زیندوو دەکرێنەوە.

دیسان وەك چۆن لە بەهاردا مێشەکان کە ژمارەیان زۆر لە مرۆڤەکان زیاترە، لە یەك چرکە ساتدا وەدەردەکەونەوە. ئەمەش نموونەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کە خودای گەورە دەتوانێ لە یەك ساتدا هەموو شتێك بکات.

بێگومان دەکرێ زۆر نموونەی تر لەم ڕووەوە بهێنرێتەوە.

## باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی پێویستە

وەك هەر بنەمایەکی ئیسلام، باوەڕ بوون بە ڕۆژی دواییش هۆی بێشوماری هەیە. خۆ باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی ئەنجامێکی مەجبووریی باوەڕ بە خودایە. چونکە گشت ئەو سیفەتە جوانانەی خودای گەورە کە لە دونیادا گەورەیی دەنوێنن، ئەوە پێویست دەکەن کە ڕۆژی دوایی بوونی هەبێ. بۆ نموونە خودا گیان (الحکیم —

دانا)یه. بۆیه هەموو شتێك بە هەزار و یەك حیكمەت و بە شێوەیەكی پڕمانا بەدیدێنێت. هەر لەبەر ئەمەیە ئەو مرۆڤەی كە بەو هەموو بەهرە بێشومارەوە ڕازاندویەتییەوە، مەحكوومی عەدەمی ناكات. درێژە بە بوونی دەدات لە دونیای جوانییەكاندا بە جۆرێك قابیلی بالآیی بێت.

خوا گیان (الرحمان – دلۆڤان)ە. خاوەنی بەزەییەكی بێ كۆتا و بێسنوورە. بۆیە كە مرۆڤ داوای نەمریی دەكات، پێی دەبەخشێت. ئێ خۆ ئەوەی ئەم حەز بە نەمرییەی بە مرۆڤ داوە، هەر خودایە. ئەگەر بێت و وای لێبكات بەپەرۆشییەوە داوا بكات و نەشیداتێ، ئەوە لە دلۆڤانیی ئەو ناوەشێتەوە.

خودا (عادل – دادگەر)ە. لەبەرئەوەی دادی ڕەهای ئەو لەم دونیایەدا بەدینەهاتووە، لە دونیایەكی دیدا بەدیدێت.

خوای گەورە (الحفیظ – پارێزەر)ە. هەموو شتێك دەپارێزێت. ئەگەر شكڵ و شێوە و پێكهاتەی شتەكانیش بگۆڕێت، ئەوە بوونیان لەناو نابات. نەخاسمە مرۆڤ كە كاملترین بەدیهێنراویەتی، نایەڵێت لەژێر گڵدا بڕزێت.

خودا (الكریم – ڕێز لێنەر)ە. واتە حەزی لە ڕێز لێنان و چاكە لەگەڵ كردن و خەلات كردنە. ئەو خەلاتانەشی دەدات بەو بەندانەی

کە بە پابەندی کردن لە فەرمانەکانی ژیاون. پەسلانیش ئەو جێیەیە کە ئەو ڕێز و دیارییانەی لێوەردەگیرێت.

بونیادی مرۆڤیش، بوونی ڕۆژی دوایی پێویست دەکات. چونکە ئەو بوونەوەرە کە ئاوا بە جوانی و کاملی بەدیهێنراوە، بەو هەموو بەهرە هەمەلایەنەیەوە، دوای بەسەر بردنی ژیانێکی کورت، دەمرێت. کەواتە ئەم تایبەتمەندییە نایابانە، لە شوێنێکی تردا و بە شێوەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێشتر، درێژەیان دەبێت. وا نەبوایە، پێویستی نەدەکرد مرۆڤ ئاوا بە کەمالیی بەدیبهێنرێت.

هێزی خەیاڵی مرۆڤیش، خوازیاری ئەبەدییەت و نەمرییە. ئەگەر بە کەسێك بوترێ:

– تەمەنێکی یەك ملیۆن ساڵیت پێدەبەخشرێت و لەو ماوەیەدا دەبی بە شای جیهان، بەلام سەرەنجام دەمریت. ئایا ئەمەت دەوێ یان ئەوەی تەمەنێکی کورت و زەحمەت بەسەر بەریت، لێ دوای مردن ژیانێکی ئەبەدیی و کامەران بەشت بێ؟

ئەو کەسە، ئەگەر تووشی وەهم نەبووبێت و توانیبێتی خۆی لە هەستە نەفسانییەکانی ڕزگار بکات، دەڵێت: "من ژیانێکم ناوێ کۆتاکەی نەمان بێ، با یەك ملیۆن ساڵیش بێت و وەك پاشاش بژیم. من ڕازیم بە ژیانێکی ئاسایی و زەحمەت، وەلێ کۆتاکەی ئاسوودەیی بێت." چونکە هەستە مەعنەوییەکانی مرۆڤ، نەمریی دەخوازێت. بیر

و ئاواتە بێسنوورەکانی، جێی نابێتەوە لەم دونیا کاتییە، جا هەر چەنێکیش درێژ بێت.

مرۆڤێك خاوەن بیری ڕاست بێت، لەبەرانبەر نەماندا بە ژیان لە دۆزەخیشدا قایل دەبێت. چونکە ژیان، واتە بوون. خراپترین بوونیش، باشترە لە نەبوون و لەناو چوون.

بۆیە بەدیهێنانی دۆزەخ، ڕەحمەتێکی خودایە. چونکە هەموو تاوانبارێك زیندانیی هەتاهەتایی پێ باشترە لە لەسێدارەدان.

## سوودەکانی باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی

ئیسلام بۆ فەراهەم هێنانی بەختەوەریی و کامەرانیی بۆ مرۆڤایەتی هاتووە. بۆیە لە باوەڕبوون بە ڕۆژی دواییدا، چەندین هۆکاری بەختەوەر بوون هەیە:

١- کەسێك بەڕاستی باوەڕی بە ڕۆژی دوایی هەبێت، لەدەست گوناه و خراپەکاریی و شتانی زیان بەخش هەڵدێت. چونکە دەزانێت ڕۆژێك سزای ئەو کارانەی وەردەگرێت. باوەڕی وایە ئەگەر لەم دونیایەش ڕزگاری ببێت، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا سزای کارەکانی وەردەگرێت.

لەم سۆنگەیەوە، باوەڕ بە ڕۆژی دوایی وەك پۆلیسێك لە دڵی مرۆڤدا دەوەستێ و ڕێگریی لێدەکات لە خراپەکاریی. بەتایبەت گەنجان  کە توێژە بەهێزەکەی کۆمەڵن، لە دەستدرێژیی کردنە سەر

بێ هێز و بێ توانا و پیر و خەڕۆکان پاشگەز دەکاتەوە. ترسی دۆزەخ نەبوایە، بەهێزەکان دەکەوتنە دوای بەرژەوەندی و کەیف و سەفایان و دونیایان لەوانی دی دەکرد بە دۆزەخ.

لەم گۆشەنیگایەوە بڕوانین، دەبینین باوەڕ بە پەسلان ئارامیی و تەناهیی نێو جڤاك دەستەبەر دەکات.

٢- کەسێك باوەڕی بە خودا بێ، لە ترسی مردن ڕزگاری دەبێت. ئەوەش کە لە مردن نەترسێ، هیچ ترسێکی دونیایی نییە بتوانێ بیترسێنێت. (یوونس ئەمرە) وتەنی، باوەڕ بە پەسلان وا لە مرۆڤ دەکات بڵێت:

بۆ لە مردن ئەترسی؟

مەترسە، بۆ ئەبەد هەی

مردن بۆ کەسێکی باوەڕدار، دەستپێکی نەمریی و بەختەوەریی ئەبەدییە. کەسێك باوەڕی بە ڕۆژی دوایی نەبێت و پێی وا بێت مردن نەمان و لەناو چوونە، ترسێکی وای مردن تەنگی پێهەڵدەچنێ، هەر ساتێکی تەمەنی پڕ بێ لە ئازار و مەینەتیی. بۆ ڕزگار بوونیش لەم مەینەتییانە خوو دەداتە مەینۆشی و بەکار هێنانی ماددە هۆشبەرەکان، بەم جۆرە دەبێتە ئەسیری ئەو ئارەزووە سەرشێتانانەی سەر لە مرۆڤ دەشێوێنن، تا ئەوەی کار دەگاتە خۆکوژیی.

٣- ئەوانەی باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی هەیە، هەمیشە مۆڕاڵ و ورەیان بەرزە. ئەم ورە بەرزییە ڕۆڵی هەبووە لە سەرکەوتنی موسوڵمانان بەسەر دوژمنەکانیان کە گەلێکیش لەوان بەهێزتربوونە.

(سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس) هۆی سەرکەوتنی بەسەر ئێرانییەکاندا کە خاوەنی بەهێزترین سوپای ئەو سەردەمە بوون، بەم جۆرە ڕوون دەکاتەوە:

"سەربازانی من چەند عەودالّی شەهیدی بوون لەڕێی خوادا، بەرانبەرەکانیان ئەوەندە لە مردن و بریندار بوون دەترسان..."

٤- باوەڕ بوون بە خودا ئارامی بە مرۆڤ دەبەخشێت. ئەوانەی دەزانن دونیا کاتیی و قیامەتیش باقییە، ڕزگاریان دەبێت لە چاوچنۆکی و بێئۆقرەیی و ئێرەیی. چونکە باوەڕیان وایە نیعمەتە فانییەکانی دونیا شایانی ناحەزیی و دوژمنایەتی نین. بە سەرکەوتن مەغروور و بە ژێر کەوتنیش بە جۆرێك غەمبار نابن ئەژنۆیان بشکێت.

٥- کەسێك باوەڕی بە ڕۆژی دوایی هەبێت، خۆپەرست نابێت. بۆ ئەوەی توێشوویەك بۆ قیامەت کۆ بکاتەوە، بەردەوام چاکە دەکات و دەستی یارمەتی درێژ دەکات و دۆستایەتی دەنوێنێت. لەبەرئەوەی چاوەڕوانی پاداشتە لە خودا، هەوڵ دەدات سوودی هەبێت بۆ بەندەکانی خوا. لە شوێنێکدا ئەم جۆرە کەسانە زۆرینە بن، ئەوا جڤاکێکی پڕ لە ئارامی هەیە.



٦- بـاوەڕ بـە ڕۆژی دوایـی منـداڵان لـە چـەتوونی و بێڕێـزی دەگێڕێتـەوە. هـەر وەك ڕێگـرییش دەكـات لـەوەی ئـەو مردنانـەی لـە دەوروبەریانـدا دەیبینـن، كاریگەریی خراپیان لەسەر دابنێت.

چونكە دەزانن ئەوانەی دەمرن، بەرەو نەمان و بوونە خۆڵ ناڕۆن، بەڵكو بەرەو قیامەت دەڕۆن. دەزانن ڕۆژێك گشت مرۆڤە چاكەكان لـە بەهەشتدا بەیەك دەگەنەوە و پێكـەوە دەكەونـە نێـو ژیـانێكی پـڕ لـە بەختەوەریی نەبڕاوە.

بێگومان جگە لەمـە چـاردیەكی تـر نییـە بـۆ دڵ دانـەوەی ئـازاری مردن.

با ڕووداوێكی ڕاستەقینەتان لەسەر ئەمە بۆ بگێڕمەوە:

هـاوژینی پرۆفیسـۆرێك جوانەمـەرگ دەبێـت. ئـەم پیـاوە، لەبـەر ئەوەی كەسێكی بێبـاوەڕە، هـەوڵ دەدات بـێ بـاس كردنـی قیامـەت، باسـی مـردن بـۆ كچـە بچـكۆڵەكەی بكـات. لـێ دەربـازی نابێـت لـە پرسیارە نەبڕاوەكانی كیژەكەی:

- بابە گیان، دایكم لە كوێیە؟

- لە گەشت كردندایە ڕۆڵە، دێتەوە...

- بابە! دایە كەی دێتەوە؟

– زۆری نەماوە کچم! بەم نزیکانە دێتەوە...

دوا جار منداڵەکە ئۆقرەی لێهەڵدەگیرێ و باوکی تەنگاو دەکات، دەگری، هاوار دەکات و داوای دایکی دەکات. پرۆفیسۆری بێچارە، بڕیار دەدات ڕاستیی پێبڵێت:

– بڕوانە، کچم! دایکت مرد!

– یانی چی؟.. ئیتر قەت نایەتەوە؟

– نەخێر، ئیتر قەت نایەتەوە. چونکە مرۆڤەکانیش هەر وەك شمەکەکان کۆن دەبن. وەك چۆن شمەکە کۆنەکانمان فڕێ دەدەینە زبڵدانەوە، ئاواش مرۆڤە کۆن بووەکان دەخەینە گۆڕەوە.

– بەڵام بابە! ئەو پوورەی تەنیشتمان پیرتر بوو. بۆ ئەو کۆن نەبوو، بۆ دایکم کۆن بوو؟!..

بەڵێ مرۆڤ چەنێك ژیر و زانا بێت، لە باوەڕ بە پەسلان بەولاوە دڵنەواییەکی دیکەی لەبەرانبەر مردندا پێنادۆزرێتەوە.

"منداڵان تەنها بە بیری بەهەشت دەتوانن خۆ بگرن لەبەرانبەر ئەو مردنەی بە ترسناك و گریێنەر دێتە بەرچاو". تەنها بە باوەڕ بوون بە بەهەشت دەتوانرێ بەرگەی ئەو دابڕانە بگیرێ کە مردن بەدوای خۆیدا دەیهێنێ.

٧– باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی، تاکە هێزی مەعنەوییە بۆ پیران و دەردەداران. ئەو هەستەی کە هەیانە بەوەی زۆر لە چوونە ناو گۆڕ

نزیك بوونەتەوە، تەنها بە باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی دەتوانن بەرگەی بگرن. ئێ خۆ بوونی ژیانێکی نەبڕاوە، شەوقی ژیان دەبەخشێتە لاشە سیس و منداڵەوە بووەکەیان. وا نەبوایە، دەکەوتنە بێ ئومێدییەکی گەورەوە. دونیا بۆیان دەبوو بە زیندانێك جێی ژیان نەبێت و ژیانیش دەبوو بە عەزابێك بەرگەی نەگیرێ.

بۆ کەسانی پیر کە باوەڕیان بەوە هەبێ لە بەهەشتدا تەندروستیی و گەنجێتییەکی نەبڕاوە بەدەست دێننەوە، چاوەڕوان کردنی مردن خۆشیی دەبەخشێت نەك ترس.

٨- باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی دڵنەواییەکی گەورەیە بۆ ئەوانەی لەم دونیایەدا ڕووبەڕووی ناهەقیی دەبنەوە. چونکە ئەو کەسە باوەڕی وایە لە دادگای گەورەی خواییدا مافی خۆی وەردەگرێتەوە، ناخی خۆی ناخواتەوە، قار نایگرێ و ناکەوێتە بیری تۆڵە سەندنەوە. بەوەی کە دان بە خۆدا دەگرێ، خێریشی دەست دەکەوێت. دەڵێ: "بژی دۆزەخ بۆ ستەمکاران!" و دڵی دادەکەوێت.

٩- باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی، سەرچاوەی بەختەوەرییەکی وایە لە باس کردن نایەت. موسوڵمانان باوەڕیان وایە لەوێدا بە گشت خۆشەویستانیان و لە سەرووی هەموویشیانەوە پێغەمبەر ﷺ دەگەنەوە.

بینینی جوانیی خوداش، هەر لە بەهەشتدا مسۆگەر دەبێت. بێگومان گەشبینی بە بینینی ئەو خودایەی سەرچاوەی گشت جوانییەکانە؛ خۆشییەکی سەرسوڕهێن دەبەخشێتە مرۆڤ.

ئەم خۆشییانە ناخۆشی و مەینەتی و ئازارەکانی دونیا دەسڕنەوە و کاریگەرییان نامێڵن.

باوەڕ بەو ڕۆژە چەندین سوودی ماددی و مەعنەویی تری هەیە. لەبەر ئەوەش کە یەکێکە لە گرنگترین بنەماکانی ئاینەکەمان، سێیەکی قورئانی پیرۆز باسی قیامەت دەکات.



کەسانێکی پیر باوەڕیان بەوە هەبێت لە بەهەشتدا تەندروستیی و گەنجێتییەکی نەبڕاوە بەدەست دێننەوە، لە مردن ناترسن.

بە پرسیارێکی (جونەیدی فەیلەسووف) کۆتاییمان بەم باسە هێنا. جونەید وتی:

– مامۆستا! بۆچی سەرباری ئەو هەموو هەقیقەتانە، تەنانەت موسوڵمانانیش لە قیامەت دەترسن؟ باشە هۆی ئەمە چییە؟

- جونەید! سوپاست دەکەم بۆ ئـەم پرسـیارەت. ئـەوەی وتـت، بەڕاستی وایە. وێڕای ئەوەش کە باوەڕمان بە ڕۆژی دوایـی هەیـە، لـێ لە ناخی هەمووماندا کەم تا زۆر ترس لە مردن هەیە. هۆی ئەمـە، لای هەموو کەسێك وەك یەك نییە.

سـەرەکیترین هـۆی ترسـان لـەو مردنـەی پاسـەپۆرتی پەسـلانە، لاوازیی باوەڕە. چەند باوەڕ بەهێز بێت، ئەوەنـدە ترسـی مـردن کـەم دەبێت. بۆیە پیاوچاکە گەورەکان، کە خاوەنی باوەڕی بەهێز بوونـە، بەخەندەوە لە ڕووی مردنیان ڕوانیوە و بە کـەیف خۆشـییەوە بـەرەو قیامەت هەنگاویان هەڵگرتووە. وتوویانە: "مـردن دێ، بـەخێر بـێ" و وەك ئەوەی بچنە باخی بەهەشتەوە، دوا وتـەیان لـە ژیانـدا (بسـم الله الرحمن الرحیم) بووە.

هۆیـەکی تـریش، خـەمی دابڕانـە. مـردن هـەر چییەك بێـت، جیـا بوونـەوە و دابڕانـە لـەو دونیایـەی لێـی ڕاهـاتووین و ئەوانـەی لێـرە خۆشمان ویستوون.

هەندێك کەسیش لەبەرئەوەی ئەو ئامادەکارییـەی بـۆ ڕۆژی دوایـی کردوویەتـی، بە قەدەر پێویست نازانێـت، لـە مـردن دەترسـێت. ئەمـە ترسانە لە بابی پێویست حازر نەبوون بۆ ڕۆژی دوایی...

بەڵام بەربڵاوترین هۆکاری ئێستای ترسان لە ڕۆژی دوایی، ئەوەیـە هەرچی وەبەرهێنان هەیە بۆ دونیایە. (ئـەبوو حـەزم) کـە یـەکێك لـەو

پیاوچاکانەی بە دیداری یارانی پێغەمبەرﷺ گەیشتووە، بەم جۆرە گوزارشت لەمە دەکات:

"ئێمە قیامەتی خۆمان کاول و دونیاشمان ئاوەدان کردووە. بۆیە دەرچوون لەو دونیایەی هەموو هەوڵی خۆمان داوە بۆ ئاوەدان کردنەوەی و چوون بۆ ئەو قیامەتەی بە کاولی هێشتوومانەتەوە، ترسمان دەداتێ".

کەواتە بۆ ئەوەی لە چوونە قیامەت نەترسین، دەبێ باوەڕمان بەهێز بکەین. ئەوەی باوەڕمان پێیەتی، بە جۆرێك باوەڕمان پێی بێت، وەك ئەوەی لەبەرچاومان بێ.

لەم ئاراستەی ئیمانەدا، دەبێت بەردەوام بۆ قیامەت ساز و ئامادە بین. چونکە مردن کات و تەمەنی بۆ نییە، هەر کات بێت دێت.

کاتێك فریشتەی گیانکێشان دەچێتە لای حەزرەتی مووسا (سەلامی خودای لێبێت) بۆ ئەوەی ڕۆحی بکێشێت، ئەو زاتە پیرۆزە پێی دەڵێت:

– هێشتا بەتەواوی ئامادە نیم، زۆر ئیشم ماوە بیانکەم، کاتێکی تر وەرەوە...

فریشتەی گیانکێشان بەم جۆرە وەڵامی دەداتەوە:

– ئەی مووسا! ئەوە لە کەیەکەوەیە ڕۆحان دەکێشم. تا ئێستا قەت نەمبینیوە یەکێك بڵێ کارەکانم تەواو کردوون و حازرم.

بەڵێ، گشت مەسەلە ئەوەیە کە تا پێمان دەکرێت خۆمان ساز بدەین. ئێستا با بیر بکەینەوە... ئێمە تا چەند ئامادەین بۆ ئەو بانگهێشتی مردنەی هەر کاتێك بێت دێت؟ ئەوەی ڕاستی بێت، ئەگەر هیچیش حازر نەبین، هەر دەبرێین. بەڵام گرنگ ئەوەیە، بتوانین وا بکەین بچینە بەهەشت نەك دۆزەخ.



## گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەرمانﷺ قورئانە

### قورئانی پیرۆز لە چ ڕوویێکەوە موعجیزەیە؟

قورئانی پیرۆز گەورەترین بەرچۆ (موعجیزە)ی پێغەمبەرمانەﷺ. بەرچۆی پێغەمبەرانی تر، لە سەردەمی خۆیاندا ڕوویان داوە. بینینی ئەو موعجیزانەیان لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا کارێکی نەکردەیە. هەرچی ئەو گەورە بەرچۆیەی پێغەمبەرەﷺ، ئەمڕۆش هەر وەك ئەو کاتەی لەلایەن خوداوە دابەزیوە، لەبەر دەستماندایە. بەرچۆ واتە ئەو شتە دەرئاسایەی کە مرۆڤەکان دەستەوسانن لەوەی بتوانن بە کارێکی لەو چەشنە هەڵبسن. بەڵێ، قورئانی پیرۆزیش کتێبێکی وایە. ئەوە ١٤٠٠

ساڵە کەسێك نەیتوانیوە کتێبێك بێنێتە گۆڕێ، هاوشێوەی ئەو بێت. ئەمە لە کاتێکدا کە قورئانی پیرۆز تەحەددای گشت مرۆڤایەتی دەکات کە ئەگەر باوەڕیان بەوە نییە کەلامی خودایە، با بتوانن کتێبێك بنووسن شان لە شانی ئەو بدات.

ئەوانەی هەوڵیان داوە کتێبێکی هاوشێوەی قورئان بنووسن، بەردەوام مایەپووچ بوونە. خودی خۆیان دانیان ناوە بەوەی کە ئەوەی نووسیویانە هیچ لەو کتێبە پیرۆزە ناچێت.

ئەها مەلا مەشهوور دەچێ دۆشاو و بەفر تێکەڵی یەك دەکات و شیرینییەکی نوێ دادەهێنێ، ناویشی لێدەنێت: (حەڵوای بەفر). سەرەتا زۆر خۆشحاڵ دەبێ بەوەی بە حسێبی خۆی داهێنانێکی کردووە. لێ کاتێك چەند کەوچکێکی لێدەبات بۆ دەمی و تامی دەکات، دەڵێت:

– من حەڵوای بەفرم داهێنا، بەڵام خۆشم بەدڵم نەبوو!

ئەوانەش کە خۆیان خستووەتە ژێر باری ئەوەی کتێبێکی وەك قورئان دابهێنن، سەرەنجام هەر وایان وتووە. ئەوەی کە کردوویانە خۆیشیان بەدڵیان نەبووە...

هەر بۆیە، هیچ ڕێیەکیان بەدەستەوە نەماوە قورئان پووچەڵ بکەنەوە، هاتوون دەستیان بۆ چەك بردووە. هەوڵیان داوە بە ئاگر و ئاسن و شەڕ و شۆڕ، قورئان لەناو ببەن. کە ئەمەش دادی نەداون،

کەوتوونەتــە هەڵبەســتنی شــتی بێبنــەما. بــەڵام زۆر جــار، لــەناو بێباوەڕانیشـدا کەسـانێك دەرکـەوتوون ناچـار بوونـە دان بـە ڕاسـتیدا بنێن. گەلێك زانای ناموسوڵمان دانیان بەوەدا ناوە کە نـاکرێ قورئـان قسەی مرۆڤ بێت... بەم جۆرە قورئان یـار و نـەیاریی ناچـار کـردووە دان بەوەدا بنێت کە کەلامی خودای گەورەیە.

***

کە قسەکانم بەمانە گەیشتن، (گۆکهان)ی چـاودێر و خۆشەویسـتی بەر دڵان، پەنجەی بەرز کردەوە:

– بڵێ، گۆکهان!

– مامۆستا! ئایا ئەم قورئانەی ئێمە لە چ ڕووێکەوە بەرچۆیە؟

– پرسیارێکی زۆر جوان و بەجێیە. ئێستا بـا بێینـە سـەر ئـەوەی قورئانی پیرۆز لە چ ڕووێکەوە بەرچۆیە:

١– دەنگ و سەدا و ئاوازی قورئان بەرچۆیە. دەنگ و ئـاوازی قورئـان ئەوەنـدە شـیرین و خۆشـە، لـە هـیچ دەنگێکـی تـر ناچـێت. تەنانـەت ئەوانەش کە لە مانای قورئان ناگەن، لە خوێندنـەوە و گـوێ لێگرتنـی تێر نابن. بگرە ئەو نەخۆشـانەش کـە دوا هەناسـەکانیان هەڵدەمـژن، حەز دەکەن گوێیان لە دەنگی قورئان بێت. کەسێکی وا کە لـە گشـت قسە و دەنگێك بێزارە، بە جۆرێـك کـە حـەز ناکـات گـوێی لـە دەنگـی

Cumhurbaşkanı Özal, Türkiye gibi Müslüman bir ülkenin insanları için adaletin refah ve demokrasiden daha önemli olduğunu söyledi

# Gerçek eşitlik fikri İslâm'da

دایکیشی بێت، کەچی بە حەز و ویستەوە دەخوازێ گوێی لە قورئان بێ. هەر بۆیە بە دیار نەخۆشەکانەوە قورئان دەخوێنرێت، بەتایبەتیش سوورەتی (یاسین).

٢- خوێندنەوە و گوێ لێگرتنیشی هەر بەرچۆیە. موسوڵمانان سەرەڕای ئەوەی ئەوەندە دەیخوێننەوە، هەر لێی وەڕس نابن. بەڵکو بەپێچەوانەوە، هەر جارێك کە دەیخوێننەوە، هەست بە تام و ئارامییەکی جیاواز دەکەن. لەم سۆنگەیەوە، ئەو کتێبەی لە هەموو کتێبێك زیاتر دەخوێنرێتەوە، قورئانە.

٣- قورئان، لەبەرکردنی زۆر ئاسانە. لەم دونیایەدا کتێبێك نییە بەقەد قورئان لەبەر بکرێ، ئینجا زۆریش بەئاسانی. جگە لە پێگەیشتووان، منداڵانی تەمەن زۆر بچووکیش قورئانیان پێ لەبەر دەکرێت. بە جۆرێك منداڵی وا دەبینین، لە تەمەنی ٤-٥ساڵیدا قورئانی لەبەرکردووە.

٤- ڕێنووس و شێوازی نووسرانی قورئانیش هەر بەرچۆیە. نووسینی قورئان بە جوانترین و پڕهونەرترین نووسینی دونیایە کە عەرەبییە.

لە نووسینەوەی ئایەتەکانی قورئانیشدا چوونیەکییەکی سەیر هەیە. ئەگەر بەوردی سەرنجی بدەینێ، دەبینین ناو و سیفەتەکانی خودا، هەمووی دەکەونە ژێر یان پاڵی یەك. ئەم حاڵەتە بەرچۆیەکە لە هیچ کتێبێکی تردا بەر چاوان ناکەوێت.

٥– قورئانی پیرۆز بەرچۆیەکی وێژەییە. چونکە لە دونیادا تەنها دوو جۆر قسە و نووسین هەیە، ئەوانیش:

أ- هۆزان

ب- پەخشان

هەر چی قورئانە، نە هۆزانە نە پەخشان... لە هەندێ شوێن لە هۆزان و لە هەندێ شوێنیشدا لە پەخشان دەچێت. بە دەستەواژەیەکی دی، شێوازی سێیەمی نووسینە کە تایبەتمەندییەکانی هەر دوو جۆرەکەی تریش لەخۆ دەگرێت. بەم جۆرە قورئانی پیرۆز سێیەم جۆری هونەری نووسینی پێشکەش بە وێژە کردووە.

٦– قورئان بەرچۆیەکی زمانەوانییە. وێڕای ئەوەی عەرەبییە، بەڵام لە هیچ قسەیەکی عەرەبی ناچێت. ئەگەر بێت و کەسێك بە عەرەبی قسە بکات، چەند ئایەتێکی قورئان بخاتە نێو قسەکانییەوە، یەکسەر دیارە. کەسێك هیچیش لە عەرەبی نەزانێت، دەتوانێت قورئان لەنێو قسەی تری عەرەبیدا جیا بکاتەوە. ئێ خۆ ئەوەی ئەم

دەوڵەمەندییــەی ئــەمڕۆی بەخشــیوەتە زمــانی عــەرەبی، قورئــانی پیرۆزە. بۆیـە وتـراوە قورئـان (عـەرەبی) نییـە (ڕەببی)یـە. قورئـانی پیرۆز تایبەتمەندیی و جوانییەکی ئیلاهیی هەیە.

٧- نەغمەی خوێندنی قوئان بەرچۆیە. تەنانەت ئەوانەش کە عەرەبی نـازانن، کاتێـك گـوێ لـە قورئـان بگـرن، لـە قـووڵایی دەروونیانـەوە کاریگەر دەبن. بەجۆرێك کەسـانی وا هـەن، بـەس بـەوەی گوێیـان لـە قورئان بووە موسوڵمان بوونە، بێئەوەی هیچیشی لێ تێبگـەن. زانـای موزیکناسی بەناوبانگی فەڕەنسـایی (مـۆریس بیـژارت) تـەنها یەکێکـە لەوانە.

٨- تــەواوی ماناکـانی نێـو قورئــان، لـە زۆر سـوورەتدا بـە پـوختی دەدرێـن. وەك بڵێـی هــەر سـوورەتێك قورئـانێکی کـورت کراوەیـە. تەنانەت سوورەتە زۆر کورتـەکانی قورئـانیش خەبـەر لـە سـەرجەمی قورئان دەدەن. پێشەوا شافیعیی کەڵە زانا فەرموویەتی:

"ئەگەر لە قورئاندا، تەنها سـوورەتی (العصـر) بهاتایـە خـوارەوە، بەس بوو".

بەم جۆرە تەنانـەت یـەکێك لـە کـورتترین سـوورەتەکانی قورئـان، ئەوەندە مانای فـراوان لـەخۆ دەگرێـت، لـە باریدایـە گشـت ماناکـانی قورئان لە خۆیدا کۆبکاتەوە.

زۆر زانای تریش سوورەتی (فاتیحە)یان بە کورتە و پوختەی قورئان داناوە. تەنانەت وتوویانە: "پوختەی گشت ماناکانی قورئان لە ئایەتی ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾دایە".

٩- قورئانی پیرۆز لە ماوەی ٢٣ ساڵدا سوورەت و ئایەت ئایەت هاتووەتە خوارەوە. هەندێك لە ئایەتەکان لەسەر ڕووداوگەلێك کە لەو دەمانەدا ڕوویانداوە و هەندێکیشیان وەك وەڵامی پرسیارگەلێك کە کراون دابەزیون. ئینجا ئایەتی وا هەیە بۆ دەستخۆشیی کردن لە پێغەمبەرﷺ و هی وایش هەیە بۆ هۆشیاری پێدانی، هاتوون. گشت ئایەتەکان فەرمان و هێڵە سوورەکانی خودای گەورە ڕوون دەکەنەوە. کاتێك ئەو هەموو ئایەتە کە لە زەمان و مەکانی جیاجیادا هاتوونەتە خوارەوە لە دووتوێی کتێبێکدا کۆ کراونەتەوە، هیچ بۆشایی و نەسازییەك لەنێوانیاندا نەهاتووەتە ئاراوە. ئەمەش بەهۆی ئەوەی ئەو زاتەی ڕێنماییداوە بەم جۆرە



بخرێنـه ڕیـزەوە، هـەر زاتـی خودایـە. هـەر بۆیـە خرانـی ئایـەت و سوورەتەکان بۆ شوێنی خۆیان و دەرچـوونی ئـەو ڕێکوپێکییـەی نێـو قورئانیش، هەر بەرچۆیە.

چونکە قورئان کە لە ماوەیەکی دوور و درێژی ٢٣ ساڵیدا هـاتووە، کاتێـك کۆکراوەتـەوە یەکێتییـەکی کامـڵ پیشـان دەدات. گشـت ئایەتەکان یـەکتری تـەواو دەکـەن، یەکدی ڕوون دەکەنـەوە و مانـای یەکتری بەهێز دەکەن. هیچ جۆرە دژیـەکی و ناتەباییـەك لەنێوانیانـدا بوونی نییە.

١٠- قورئانی پیرۆز بەدرێـژایی مێـژوو، دوژمنـی زۆری هـەبووە. بـەڵام وێڕای ئەو هەموو دژایەتی کردنە، قورئان بێشێوان و دەستکاری کران گەیشـتووەتە ئـەمڕۆی ئێمـە. تـا قیامـەتیش هـەر بـەو شـێوەیە دەمێنێتەوە. مانەوەی قورئان، سەرباری ئەو هەموو بارە ناهـەموارە، وەك ئـەو کاتـەی لەلایـەن خـوداوە نێردراوەتـە خـوارەوە، ئـەوەش بەرچۆیە. چونکە ئـەوەی پارێزگـاریی لێدەکات، خـودای گەورەیـە. خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَ إِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ الحجر:٩، واتـە: "ئێمـە خۆمـان قورئانمـان دابەزاندووە و هەر ئێمەش پارێزگاریی لێدەکەین".

١١- مانـای قورئـانیش هـەر بەرچـۆیە. چـونکە قورئـان دەریایـەکی مانایـە. دەریـای زانسـت و زانیارییـە. تەنانـەت ئـەو زانایانـەش کـە

قووڵترین و فراوانترین تەفسیریان نووسیوە، ئەوەیان وتووە کە ئەو ڕاڤانەی کردوویانە، زۆر کەم و کورتن بەچاو قورئان. ئەو زانایانەی کە دەیان بەرگە تەفسیریان نووسیوە، گوزارشتیان لەوە کردووە کە ئەو لێکدانەوانەی ئەوان تەنها دڵۆپێکە لە دەریای قورئان. هەر بەڕاستی قورئان دەریایەکی بێ بنی مانایە کە ئەم سەر و ئەو سەری دیار نییە. ئەو زانایانەی خۆیان لەو دەریا قووڵ و گەورەیەی قورئان داوە، ئەو مرواریی زانیارییانەی توانیویانە لێی دەربێنن، بۆ سوودی مرۆڤەکان پێشکەشی دەکەن. لێ مرواریی ماناکانی نێو دەریای قورئان نابڕێتەوە. هەر زانایەکی نوێ کە دێ، بە کۆششی نوێ مانای نوێ لە قورئان دەدۆزێتەوە.

قورئان لەو ڕۆژەوەی نێردراوە، بۆ گشت چەرخ و سەردەمێك دێتە گۆ. بۆیە لە هەر چەرخێکی نوێدا، مانای تەواو نوێی لێ دۆزراوەتەوە.

زانایانی بوارە جیاجیاکانی زانست، کە قورئان دەخوێننەوە، هەر یەکەیان بەپێی بواری شارەزاییەکەی خۆی، مانای جیا لە قورئان دەردێنێت. هەر زانستەو لە هەمان ئایەتدا، مانای جیا جیا دەردەهێنێت. لەگەڵ پێشڤەچوونی زانستدا، ماناکانی قورئان ڕوونتر دەبنەوە، بەم جۆرەش باشتر لێی تێدەگەین.

قووڵییەکی بێ بنی مانا... مانای نوێ کە لە هەر چەرخێکدا تازە دەرهێنراوە... دەرهێنانی مانای جیا جیا لە لایەن هەر زانایەك و

بەپێی پسپۆڕیی خۆی... ئەم تایبەتمەندییانە، لە هیچ کتێبێکی تردا نین. گشت ئەمانە ئەوە پشان دەدەن کە قورئانی پیرۆز لە ڕووی ماناشەوە بەرچۆیە.

١٢- قورئان تیشک دەخاتە سەر هەندێك بابەت، کە ئەو کات هێشتا نەزانراو بوون. هەندێك هەقیقەتی وا لە قورئاندا ئاماژەیان پێدراوە، کە مومکین نەبووە زانایانی ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر پەییان پێبردایە. بۆ نموونە: لە دوو ئایەتدا ئاماژە بەوە دراوە دوو ئاو کە یەکێکیان سوێر و ئەوی تریان شیرینە، سەرەڕای ئەوەی ئاوەکانیان دەڕژێنە ناو یەك، لێ بەهۆی پەردەیەکی نەبینراو لەنێوانیاندا، ئاوەکانیان تێکەڵ نابن. ١٤ سەدە دوای ئەم هەواڵدانەی قورئان، لێکۆڵەری دەریاوانیی بەناوبانگ (کاپتن کۆستۆ) ئەوەی سەلماند ئاوی ئەو ڕووبارانەی دەڕژێنە نێو دەریاکانەوە، ئاوەکانیان بە هیچ جۆرێك تێکەڵیان نابن. کاتێك پێی دەڵێن ئەم ڕاستییە ١٤ سەدە لەمەوبەر لە قورئاندا ئاماژەی پێدراوە، دەڵێت:

"باوەڕم وایە ئەو قورئانەی ١٤ سەدە پێشی زانست کەوتووە، کەلامی خودایە."

***

قورئـان باسـی چـەند ڕووداوێکـی مێژووییشـی کـردووە، هـەواڵی ئەوەی داوە کە لـە ئاینـدەدا ڕوو دەدەن. ئـەو ڕووداوانـە دواتـر، وەك چۆن قورئـان ئامـاژەی پێـداون، ئـاوا ڕوویـان داوە. بـۆ نموونـە: لـە جەنگێکی نێوان دوو زلهێزترین دەوڵەتی ئەو سـەردەمەدا کـە ئێـران و ڕۆمـەکان بـوون، ئێرانییـەکان سـەرکەوتنیان بەدەسـت هێنـاوە. ئـەم سـەرکەوتنەی ئێرانییـە ئاگرپەرسـەکان، بـت پەرسـانی مەککـەی خۆشحاڵ کردووە. چونکە سەرکەوتنی ئێرانییەکان کـە باوەڕیـان بـە خوا و پێغەمبەر نەبووە بەسەر ڕۆمە فەلەکان، وا لێـك دراوەتـەوە کـە بە جۆرێك لە جۆرەکان ژێر کەوتنی باوەڕە بە خـودا. موسـوڵمانانیش بەم ڕووداوە نیگەران بوونە. ئایەتێك لەسەر ئەمە دابەزیوە و خەبەری ئەوەی داوە کە دوای چەند ساڵێکی تر ڕۆمەکان بەسەر ئێرانییەکانـدا سەردەکەون.

هەر بەڕاستیش، دوای ماوەیەك ڕۆمەکان سەرکەوتنێکی گـەورەیان بەسەر ئێرانییەکاندا هێناوە.

بـەم جـۆرە زۆر ڕووداو کـە قورئـان بـە شـێوەیەکی شـاراوە یـان ئاشکرا خەبەری لێداون، لە کاتێکی دواتردا ڕوویانداوە.

هەواڵدان دەربارەی شتانێکی لەم شێوەیە کە دواتـر ڕوویـان داوە، بەرچـۆیەکی گـەورەی قورئانــە. چـونکە ئـەو چـۆنی فـەرمووە، وا ڕوویداوە.

## ڕووێکی قورئان هەیە بەرچۆ نەبێت؟

لەم نێوەندەدا زەنگی کۆتایی وانە لێیدا. لە گۆکهانم پرسی:

- ئێستا تێگەیشتیت قورئان لە چ ڕووێکەوە بەرچۆیە؟

- بەڵێ، مامۆستا! تێگەیشتم. بەڵام بەو پرسیارەم، تۆم گەلێك ماندوو کرد. خۆزیا بۆ ئەوەی ماندووت نەکەم، پرسیارەکەم بە جۆرێکی تر بکردایە...

- بۆ نموونە چۆن؟!

- بۆ نموونە دەمتوانی بۆ ئەوەی بتوانیت زۆر بەکورتی وەڵام بدەیتەوە، بمپرسیایە:

"مامۆستا! قورئان لە چ ڕووێکەوە بەرچۆ نییە؟"

- ئافەرین، گۆکهان! باشترین پرسیارێك کە ببێتە هۆی کورت کردنەوەی ئەم بابەتە، ئەم پرسیارەیە. چونکە هیچ شتێك نییە لە قورئاندا بەرچۆ نەبێت. قورئان کتێبی خودایە، قورئان گەورەترین و زیندووترین بەرچۆیە کە خودای گەورە بەخشیویەتییە دوا پەیامبەری کە حەزرەتی موحەممەدە ﷺ.

کتێبێکی وا کە دەقاودەق وتەی خودایە، لە ڕووی پەیڤییەوە، لە ڕووی دەنگ و نەوایەوە، لە ڕووی کەوتنە سەر پەڕەی و پارێزران و مانییەوە، بەرچۆیە. واتە شتێکی دەرئاسایە، لە کاری مرۆڤ بەدەرە. نووسینی شتێکی وەك ئەو، مەحاڵە.

## قورئان مرۆڤ بۆ چی بانگ دەکات؟

ئـەو تاکـە کتێبـە خودایيـەی کـە لەسـەر زەوی بـە دەسـتکاری نەکراوی ماوەتەوە، بـە هەقیقەتـەکانی نـاوی بانگهێشتی مرۆڤایـەتی دەکات بۆ لای خودای گەورە. ئامۆژگاریی مرۆڤ دەکات بۆ ئەوەی دان بە بوون و یـەکتایی خـودای گـەورە بنێـت و خـۆی تەسلیمی بکـات و هاوەڵی بۆ دانەنێت و بـەم جـۆرەش خـۆی بخاتـە نێـو ئاسوودەیی و ئارامییەوە.

یەکەمین و سەرەکیترین پەیامێك کە قورئان ئاڕاستەی مرۆڤایەتیی دەکات، یەکتاپەرسییە. واتە باوەڕ بوون بـە بـوون و یـەکتایی خـودا. قورئان لە هەموو شتێکی ئەم دونیایە دەدوێت. وەلێ لـە هـەموو ئـەو شتانەی باسیان دەکات، ئەو ڕێیە پیشـان دەدات کـە بـۆ لای خـودای گەورە دەچێت. خودا هیچ شـتێکی لـەم دونیایـەدا بـەبێ هـودە و بێ مەبەست بەدینەهێناوە. بـەڵام یەکـەمین و سـەرەکیترین ئـەرکی سـەر شانی هـەموو بوونـەوەرێك ئەوەیـە کـە وەك جێدەسـتێکی خـودایی، هەوڵ بدات ببێت بە ئاوێنەیەك، ناو و سـیفەتە جوانـەکانی ئـەو تیایـدا ڕەنگ بدەنەوە.



گشـت بوونـەوەرانی دەرەوەی مرۆڤـی خـاوەن هەسـت و ژیریـی، ئـــەم ئەرکـــە ئۆتۆماتیکیانـــە

جێبەجێ دەکەن. بەو جوانییانەی بە ڕووپانەوە دیارە، دەبن بە ئاوێنەیەك بۆ ناو و سیفەتە جوانەکانی خودای گەورە. ئەوانەی کە خاوەنی ئاوەز و هەستن دەڵێن:

– چەند جوان بەدیهێنراون! بەم جۆرە جوانیی بوونەوەران دەبێ بە ڕێیەك مرۆڤەکان بۆ لای ناو و سیفەتە جوانەکانی خودا دەبات. بەڵام مرۆڤ پێویستە لەسەری ئەم ئەرکی بوون بە ئاوێنەیە بە زانینەوە ئەنجام بدات و ئەقڵ و ئیرادەی تێدا بەکاربهێنێت. لەڕێی ئەو خووڕەوشتانەوە کە بە بەجێ گەیاندنی فەرمانەکانی خودا و خۆ بەدوورگرتن لە قەدەغەکراوەکان جوانی دەکات، دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤەکانی تریش بەرەو لای خودا بانگ بکات. بەم جۆرە بە زمانی حاڵ دەڵێت: "پەروەردگارمان ئەڵڵایە. ئەگەر بەندایەتی بۆ ئەو بکەن، خووڕەوشتتان وەك هی من جوان دەبێت".

کە گوتوبێژەکەمان لە کاتی پشوودا بەم جۆرە درێژەی کێشا، دیسان زەنگ لێی دایەوە. گۆکهان وتی:

– مامۆستا گیان! داوای لێبوردن دەکەم، نەمهێشت پشووێك بدەیت.

منیش ئەم وەڵامەم دایەوە:

– دەمادام داش بە داش! چونکە منیش نەمهێشت تۆ پشوو بدەیت!...



## بۆچی قورئانی پیرۆز بە ٢٣ ساڵ دابەزی؟

لە پۆلی هەشتەمی بنەڕەتی بووم و باسمان کتێبە ئاسمانییەکان بوو. قوتابییە ئازیزەکانم وەك هەمیشە بەوریاییەوە گوێیان گرتبوو. ئەمە لە پرسیارەکانیاندا دیار بوو:

یەکەم پرسیار لە (ڤۆڵکان)ەوە بوو:

– مامۆستا! بۆچی کتێبە پیرۆزەکەمان لە ماوەیەکی دوور و درێژی ٢٣ ساڵی دابەزیوە؟

– ئافەرین، ڤۆڵکان! پرسیارێکی زۆر جوانە. قورئان کە دوایین و پیرۆزترین کتێبی ئاسمانییە، لە هەموو ڕوویەکییەوە پڕمانا و جێی سەرنجە. ئەوەش کە بە ٢٣ ساڵ ئینجا تەواو بووە، هەر مانادارە. دەتوانین هۆیەکانی ئەمە، بەم شێوەیە پوخت بکەینەوە:

١- هاتنــه خــوارەوەی قورئــان ئایــەت بــە ئایــەت و ســوورەت بــە سوورەت، ئاسانکاریی بۆ نووسینەوەی فەراهەم هێناوە. پێغەمبەرﷺ ئــەو ئایەتانــەی بــۆی دەهاتنــە خــوارەوە، بــە ســرووش نووســانی دەنووسینەوە... ئــەم سرووش نووسانە ژمارەیان چل کــەس بــوو. پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتانەی لە دڵ و مێشکیدا تۆماری دەکردن، بۆی دەخوێندنەوە، ئەوانیش دەیاننووسینەوە. دوای نووسینەوەشی، هەر لەژێر چاودێریی ئەودا لەگەڵ یەکتر بەراوردیان دەکرد. بەم شێوەیە ئایەتەکان وەك ئەوەی لە خودای گەورەوە دەهاتن، ئاوا بەرێکی و بێ کەموکوڕیی دەنووسرانەوە. ئەگەر قورئـان بەیەك پارچەیی بهاتایە، ئەم کاری نووسینە زۆر سەخت دەبوو.

٢- پێغەمبەرﷺ بۆ ئەوەی قورئان وەك چۆن لە خوداوە دەهات ئـاوا تۆمار بکرێت، هەر بە نووسین نەدەوەستا، بەڵکو بە یارانیشی لەبەر دەکردن. دابەزینی قورئــان بــەش بــەش و پارچــە پارچــە، ئــەم لەبەرکردنەشــی ئاســان دەکــرد. ئەگــەر بــە یــەك پارچــە بهاتایــە، لەبەرکردنی کاتێکی زۆری دەویست.

٣- خــودای گــەورە ئــەو پرسـیارانەی نـاو بـە نـاو لـە پێغەمبـەر ﷺ دەکران، بە ئایەتی قورئانی وەڵامی دەدانەوە. بەم جۆرە، خەڵکی و پرسیارەکانیشیان بەهەند وەرگیراون.

٤- قورئـان هاوكـات كتێبێكـی پەروەردەییـە. یـەكێك لـە ڕێگاكـانی پـەروەردەش ئەوەیـە ڕاسـتییەكان هێـدی هێـدی و پـەیتا پـەیتا فێـر بكرێن، تا بتوانرێ كەسەكان ڕابهێنـرێن. بۆ ئـەوەی وا لـە مرۆڤـەكان بكرێ بتوانن واز لە خووە خراپەكانیان بهێنن، پێویسـت بـە ماوەیـەك دەكات. بۆ نموونە: قەدەغەكرانی مـەی نموونەیـەكی جـوانی ئەمەیـە. یەكەمین ئایەت كە دەربارەی مـەی هاتووەتـە خـوارەوە، بـاس لـەوە دەكات كە مەی زیانەكانی پترن لـە سـوودەكانی. دووەمـین ئایـەتیش كە دابـەزیوە، داوا دەكـات لـە كـاتی مەسـتییدا، كـەس تـوخنی نوێـژ نەكەوێت. سێیەمین ئایەتیش كـە دوای ئەمـە دابـەزیوە، باسـی ئـەوە دەكات كە مەی بە یەكجاری قەدەغـە و حـەرام كـراوە. ئـەم میتـۆدی پلەبەندییە كاریگەریی زۆری هەبووە و هەر لەگەڵ قەدەغەكردنی مەی خواردنەوەدا، كووچە و كۆڵانەكانی مەدینە مـەییان وەك ڕووبـار پێـدا ڕۆیشـتووە. چـونكە هــەر كەسـە و ئـەو كوپـە مەییانـەی لەماڵـەوە هەڵیگرتوون، هەڵیڕشتوونەتە كۆڵانەوە.

٥- قورئـان پایـەكانی ئیسـلامی خسـتووەتە ڕیزبەندییـەوە. بـەو یەكـەمین ئایەتانـەی لـە مەككـەدا هاتوونەتـە خـوارەوە، بیروبـاوەڕی خـەڵكیی ڕاسـت كردووەتـەوە. پێشـینەی داوەتـە بابـەتی هـەبوون و یەكتاییی خودا، پاشان هاتووەتە سەر باسی پەرستشەكان. لـە ساڵە بەراییەكانی هاتنی قورئانـدا، موسـوڵمانان باوەڕیـان بـەهێز كـردووە.

پاشـان ئـەو پەرستشـانەی داوایـان لێکـراوە، ئاسـانتر جێبـەجێیان کردوون.

٦- قورئان بەوەی وەڵامی ئەو پرسیارانەی دەدایەوە کە لە پێغەمبەر ﷺ دەکران، ئەوەی دەسەلماند کە ئەو زاتە نێردەی خودایە. چونکە خـودای گـەورە ڕاسـتەوخۆ وەڵامـی ئـەو پرسـیارانەی دەدایـەوە کـە ڕووبەڕووی دەکرانەوە. ئەو شتانەی خۆشەویست ﷺ نەیدەزانین یـان گومانی لێیان هەبوو، خودا بەرسڤی دەدانەوە. بەم شـێوەیە ئەوانـەی گوێبیسـتی دەبـوون، باشـتر بۆیـان ڕوون دەبـووەوە قورئـان کـەلامی خودای گەورەیە.

هەندێ جاریش، خـودای گـەورە دەرەتـانی پیشـان دەدا بـۆ ئـەو ڕووداوانەی دەهاتنە پێش. بێگومـان بـۆ ئـەوەی کـە لـە کـاتی هاتنـە ئـارای بوویەرێکـدا و لـە کـاتی خۆیـدا ڕێگەچـارە بدۆزێتـەوە، دەبـوو قورئان ئایەت ئایەت و لە ماوەیەکی زەمەنیدا بێتە خوارێ.

***

بەڵام ئەو قورئانە کە لە ماوەیەکی دوور و درێژی ٢٣ساڵیدا تـەواو کراوە، یەکیەتییەکی وا پیشان دەدات وەك ئەوەی بە جارێك و هەموو پێکڕا هاتبێتە خوارەوە. کاتێك قورئان لەسەر ڕێنمایی خودای گـەورە لـە دوو تـوێی کتێبێکـدا کۆکراوەتـەوە، هـیچ بۆشـایی و ناکۆکییـەك

لەنێوان ئایەتەکاندا نەهاتووەتە کایەوە. بەڵکو ڕێک بەپێچەوانەوە، هەم لەنێوان ئایەتەکاندا سازان و تەواوکارییەکی زۆر جوان هەیە، هەمیش سوورەتەکان پەیوەندییەکی بەهێزی وا لەنێوانیاندا هەیە کە یەکدی تەواو دەکەن و یەکتر ڕوون دەکەنەوە.





# مەناسیکی حەج

## کۆبوونەوەی لوتکەی

## سالآنەی جیهانی ئیسلامیی

حەج یەکێکە لە پێنج پایەکەی ئیسلام. پێنجەمین پایەیەتی. لەسەر موسوڵمانی خاوەن سامان و تەندروستیی فەرزە کە لە تەمەنیاندا جارێك بەجێی بگەیەنن... وەك گشت فەرمانە خوداییەکانی تر، حەجیش حیکمەتی مەزن و هۆکاری قووڵ و مانای گەورە لەخۆ دەگرێت...

***

بەر لە هەر شتێك دەبێت ئەوەمان بۆ ڕوون ببێتەوە: کە ئایا بۆ ئەو ئاینەمان کە هیچ پەردە و میانگیرێك لەنێوان بەندە و خوا دانانێت و ڕێ بە هیچ شتێك نادات بۆنی هاوبەش دانان بۆ خوای لێبێت، زیارەتی کەعبەی کردووە بە یەکێك لە پایە بنەڕەتییەکانی خۆی؟

مرۆڤ دەتوانێت دەستی ڕاستەوخۆ بۆ خوا بکاتەوە. دەستی، دڵ و سەرتاپای دونیای دەروونی... ئەی کەوابوو، دیاریکردنی شوێن لەم ڕووکردنە مەعنەوییەدا، لەم بەندایەتییە زەلاڵەدا لەبەر چییە؟ ئەی چما کەعبە بونیادێکی ماددی نییە؟

بۆ ئەوەی بتوانین لەمە تێبگەین، دەبێ بەچاکی لە مانای کەعبە تێبگەین. چونکە ئەو، زۆر لەودیو و لە سەرووی بوونە ماددییەکەیدا، مانای مەعنەویی لەخۆدەگرێت. هێمایەکی دەستنیشان کراوە و لەلایەن پەروەردگاری تاك و تەنهاوە کراوە بە دیاریی بۆ مرۆڤایەتی.

مرۆڤ تەنها لە ئەقڵ پێك نەهاتووە. ئەقڵ بەڵگە بۆ یەکیەتیی خودا دەدۆزێتەوە و دەسرەوێ... مرۆڤ جگە لەوە، لە دڵیش پێکدێ... دڵ واتە هەست، خۆشەویستیی، ئەوین... ئەوەی بە ئەقڵی یەکیەتیی خودای بۆ دەربکەوێ، بە دڵیشی خۆشیدەوێ. بە ئەوینی ئەو پڕ دەبێ، مەست دەبێ، بە گریە دێ... خۆشویستنی شتانی تر

بە پێویستییەکی ئەم خۆشەویستییە دەزانێت، هەر بۆیە ئەوانیشی خۆش دەوێت...

ئا ئەو زەمان و مەکانەی تێیدا هەستەکان دەگەنە چڵەپۆپەی بەجۆش هاتن و مرۆڤ لە تەوقی سەرەوە تا بنی پێ بە عەشقی ئیلاهی و مەحەببەتی ڕەسولوڵڵا دەشۆرڕێتەوە، حەج و کەعبەیە.

کەعبە یەکەم پەرستگایە کە باس لەوە دەکرێ دەگەڕێتەوە بۆ حەزرەتی ئادەم، بەڵام لەوە دڵنیاین کە لەلایەن حەزرەتی ئیبراهیمەوە بەرز کراوەتەوە... لە شوێنێکی وشك و ڕەق و تەق بنیات نراوە، تا جوانیی دەوروبەر و شتانی دیکەی ماددی نەبنە هۆی سەرنج ڕاکێشان، تا ببێت بە هەوارێك تا ئەبەد بەیداخی یەکتاپەرسی تێدا بشەکێتەوە.

کەعبە چەقە... چەقێکی ئیلاهییە گشت ڕەنگ و زمان و نەریت و نەتەوەکان لەخۆی کۆ دەکاتەوە و لەیەك دەیانتوێنێتەوە... لە دەوری کەعبە ڕەنگ جیایە، زمان جیایە. بەڵام کەس ئەوی تر بە جیا لە خۆی نازانێت. چونکە دڵ و دەروونەکان لە خۆشیی یەکتاپەرسی باڵ دەگرن و دەبن بەیەك و تەواوکەری یەکدی.

کەعبە لوتکەیە... لەوێدا لە ئەوینی ئەڵڵا و ڕەسولوڵڵا بە (لبیك)ەوە باڵ دەگیرێ. ئەو کۆرسە گەورەیە بەم شێوەیە هاواری خودا دەکات:

"– خودایە! دیسان بەدەم بانگەوازی تۆوە هاتمەوە. هاتوومەتە بەر دیوانت تا گشت فەرمانەکانت بەجێ بگەیەنم. خودایە! بەدەمەوە چوونی گشت بانگەوازێکی تۆ ئەرکی سەرشانی منە. تۆ لە دەسەڵاتتدا هاوبەشت نییە. خودایە! بە سەرتاپای وجوودمەوە، ڕووم لە تۆ کردووە. ستایش بۆ تۆیە، نیعمەت هی تۆیە، موڵك هی تۆیە. لە گشت ئەمانەدا، تۆ هاوبەش و هاوشانت نییە!"

بەم (تەلبییانە) ئەو پاتریانەی ڕۆح کە بارگەیان دابەزیوە، دووبارە بارگاوی دەبنەوە... لە دڵەکاندا نووری ئیمان دەدرەوشێتەوە. هەستەکان پڕ دەبنەوە. کەعبە وەك بڵێی دەبێ بە دڵێك و خوێنی تازە و خاوێن بۆ جەستەیەکی مەزن کە خانەکانی موسوڵمانانن، پەمپ دەکات. هەر بۆیە حاجی، ناوەوە و دەرەوەی خۆی دەشوا، خاوێن دەبێتەوە و گوناهەکانی لێدادەماڵرێ، وەك ئەو کاتەی لێدێت کە لەدایك بووە...



قوربانی هێمایەکە بۆ گوزارشت کردن لەوەی ئامادەگیی هەیە بۆ ئەوەی هەموو شتێك لەڕێی خوادا فیدا بکرێت.

***

حەج قوربانی کردنە. بەو خوێنەی دەڕێژرێ، ئەوە دەسەلمێنرێ کە

ئامادەگیی هەیە بۆ ئەوەی هەموو شتێك لەڕێی خوادا فیدا بکرێت. بەمە یادی حەزرەتی ئیبراهیم(سەلامی خوای لەسەر بێ) دەکرێتەوە کە پێشەنگی بانگەوازی یەکتاپەرسییە. چونکە ئەو تەنانەت لەوەش نەگەڕابووەوە ئامادەییی تێدا بێ بۆ ئەوەی جگەرگۆشە زۆر خۆشەویستەکەی خۆی بکات بە قوربانی. خودای گەورە لەڕێی قوربانییەوە ئەم ڕووداوەی کردووە بە هێمایەك و فەرمانی داوە ئێمەش وەك پەند وەرگرتنێك لێی، دووبارەی بکەینەوە.

حەج هەڵاتنە لە گوناه. بە نەکردنی بەشێك لەو کارانەی وەکو تر ڕێگە پێدراون، هەموو ئەندامەکان تەنها و تەنها ڕوو لە خودا دەکەن و فەرمانبەرداری دەبن و بەم شێوەیە ئەوانیش یەکە بە یەکە وەك ئەوەیان لێدێت قوربانی خودا کرابن. چونکە قوربانی واتە تایبەت کردن بە خودا و فیدا کردن لەڕێی خوادا.

موسوڵمان ئەوە پیشان دەدات کە ئامادەیی تێدایە هەموو شتێك لەڕێی خوادا بکاتە قوربانی، پێشتریش لە گشت نیشانەکانی بەفیزی و خۆبەگەورە زانین تەکێنراوەتەوە و ئیحرامی بەستووە. حەج ئیحرامە، واتە گشت ئەو خۆ نواندنانەی حەزی پێیانە، بە کفنێکی سپی دەیانگۆڕێتەوە. بەم جۆرە حەج دونیایەکە تێیدا جیاوازی لەنێوان دارا و نەدار، ئاسیایی و ئەفەریقایی نامێنێت و هەموو دەبن بە یەك...

دیمەنێکی بچووك کراوە و پڕ حیشمەتی مەیدانی مەحشەر، لە حەجدا دەبینرێ. هەستی بوونی قیامەت دەخاتە ناخ و مۆخی مرۆڤەوە و بە هۆشیار کردنەوەیەك کە سرانەوەی نییە، جارێکی تر ئەو هەستە دەخاتە ناخی مرۆڤەوە کە دونیا فانییە.

***

حەج تاقیکردنەوەیەکی زەحمەتە. بەوەی ماندوو بوون و وازهێنان لە خووەکان و فیداکردنی حەز و ئارەزووەکانی تێدایە، بنەماکانی جیهادیش لەخۆدەگرێت. حەج بەهۆی ئەوەی گەشتێکە خەڵکی لە موڵك و ماڵ و حەزەکان دادەبڕێت، بریسکەگەلێك لە کۆچی پێغەمبەریﷺ تێدایە.

لە حەجدا (جەمرە) واتە بەردباران کردنی شەیتان هەیە. ئەمە هێمایەکە بۆ زیندوو ڕاگرتنی یادگاریی حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیل(سەلامی خوایان لێ بێ)، بەڵام لە بنەڕەتدا قاودانی شەیتانە لە ناخمان. حاجی بەم بەرد هاوێشتنەی بۆ شەیتان، پێی دەڵێت: "ئەی شەیتان! ئەگەر وەك ئەوەی بۆ ئەو پێغەمبەرانە وەدەرکەوتی، بۆ منیش وەدەر بکەوی و بانگم بکەیت بۆ یاخی بوون لە خودا، ئەوە منیش بەشوێن پێی ئەواندا دەڕۆم و ئاوا بەردبارانت دەکەم!"

حــەج کۆبوونەوەیــەکی لوتکــەیی ڕامیــاریی و کۆمەڵایەتییــە. گەورەترین و بەرفرەوانترین هاوکاریی یەکێتیی ئیسلامییە. کۆنگرەی داکــۆکی کــردن لــە مــافی موســوڵمانان و بڵاوکردنــەوەی بــاوەڕ و پتەوکردنی یەکێتییە.

حــەج گونجــاوترین زەمــان و زەمینــە بــۆ جیهــانی ئیســلامیی، بــۆ ئەوەی بازاڕێکی هاوبەش پێك بێنن. ناوەندێکی پیرۆزە بۆ ڕێکخستنی هەماهەنگی و بازرگانی و کۆمپانیاســازی و هــەناردە و هــاوردە کــردن لەنێوان موسوڵماناندا. ئایەتی ١٩٨ی سوورەتی (البقرة) ڕێی ئەمانەی بە موسوڵمانان داوە. بەم جــۆرە حــەج ڕێگــەی بــە قــازانجی مــاددیش داوە، بە مەرجێك نەبێتە کۆســپ لــە بــەردەم دەســتکەوت و قــازانجی مەعنەویی.

***

خودای گەورە حەج بە نسیبی گشــت ئــەو موســوڵمانانە بکــات کــە عەودالێن.



# پێغەمبەرﷺ بۆ ئەوەندە ناڕەحەتیی کێشا؟

## شوێنی ڕاستیی خۆشیی و دەوڵەمەندیی و خەیاڵ تەختی، بەهەشتە

لە پۆلی نۆیەمی بنەڕەتی بووین و باسمان ژیننامەی پێغەمبەری نازدار ﷺ بوو. بەدرێژایی چوار وانە، گشت پۆل بە جۆرێك گوێی گرتبوو، کە هەناسەی لەخۆ بڕیبوو و تەنانەت نەیدەویست لە پشووەکانیشدا بچێتە دەرەوە. ئەمە چ خۆشەویستییەکی پێغەمبەری خوایە ﷺ. ئەوەی ڕاستی بێ، منیش هاتبوومە جۆش. ئەگەر یەکێك پرسیارێکی بکردایە، لەبەرئەوەی باسەکە دەپچڕا، پەرچەکرداریان لەدژی دەنواند. بەڵام هەندێ جار پرسیاری ئەوەندە سەرنجڕاکێش

دەکران، ناچار دەبووم وەڵامیان بدەمەوە. یەکێك لەو پرسیارانە لەلایەن یەکێك لە قوتابییە زیرەکەکانی پۆلەوە بوو بە ناوی (ڕاسم).

ڕاسم وتی:

– حەزرەتی موحەممەد ﷺ خۆشەویسترین بەندەیە لای خودا و گەورەترین پێغەمبەریشە... بۆ سەرباری ئەوەی ئاوا پایەی بەرزە، تووشی ئەو هەموو ئازار و ناڕەحەتییە بووە و بێ دایك و باوك ماوەتەوە؟

دایك و باوك ئەوەی لە توانایاندا بێت دەیکەن بۆ ئەوەی منداڵەکەیان حاڵی باش و دڵی خۆش بێت. ئێ خودای مەزنیش سۆز و بەزەیی ئەوەندە زۆرە کە لەگەڵ دایك و باوکدا بەراورد ناکرێت. ئەی باشە بۆ ژیانێکی خۆشتر و دایك و باوکی نەداوەتێ؟

پرسیارێکی جوان بوو. سەرنجی هەموانیشی ڕاکێشابوو. بۆیە کەس وەك هەندێ پرسیاری تر نەیوت: "مامۆستا لێی بگەڕێ. درێژە بە باسەکەی خۆتان بدەن باشترە".

وتم:

– دەی بزانم، هەر کەسێك وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە، ئەوە لە نمرەی زارەکیدا نمرەی تەواوی دەدەمێ.

پۆل نغرۆی بێدەنگییەکی قووڵ بووبوو. تەنها (نازان) دەیویست بێتە گۆ:

– مامۆستا! بێگومان ئەوە باشتر بووە کە پێغەمبەر ﷺ ئاوا بە ناخۆشیی و هەژاریی و بێ دایك و باوکی بژی. ئەگەر ئەمە بۆ ئەو باشتر نەبووایە، پەروەردگارمان بەو جۆرە نەیدەژیاند.

ئەم وەڵامەی نازان گۆمی مەنگی پۆلی شڵەقاند.

– جا ئێمەش ئەوە دەزانین.

هی واش هەبوو دەیوت:

– تۆ سەیری ئەو وەڵامە بکە، ها!

ئەوەی ڕاستی بێ، نازانیش وەڵامەکەی خۆی زۆر بەدڵ نەبوو. لێ هیچ وەڵامێکی تریش نەبوو.

هەوڵم دا بەم شێوەیە بۆیان پوخت بکەمەوە:

ئەرکێکی زۆر گەورەی گەردوونی خرابووە سەر شانی پێغەمبەر ﷺ. ئەو ئەوەی لەسەر شان بوو کە دینی خودا کە لەبیر کرابوو، دیسان و بەجوانترین شێوە نمایشی بکات. بۆ ئەوەی بیتوانیایە ئەم بارە گرانە بە تاقی تەنها و وەکو پێویستیش بەجێ بگەیەنێت، دەبوو زۆر بەهێز و خۆڕاگر بێت. چونکە لەبەرانبەریدا حەشاماتێکی زۆر زەبەند و بێڕەحم هەبوو. بۆیە هەر لە منداڵییەوە چی ناخۆشیی ژیان هەیە چەشتی. بە سەختترین تاقیکردنەوەکانی ژیاندا تێپەڕی. هەر بۆیە هیچ زەحمەتی و ئازاردان و ئەشکەنجەیەك نەیتوانی بیتۆقێنێ و چۆکی پێدا بدا.

پێغەمبەرﷺ لە هەموو ڕوویێکەوە بۆ ئێمە نموونەیـە. بۆیـە دەبـوو هەموو بـارودۆخێکی خـۆش و ناخۆشـی بەسـەردا بهاتایـە، تـا پێمـان پیشان بدات لـەو حاڵەتانـەدا پێویسـتە چـۆن چۆنی ڕەفتـار بکـەین. بەتایبەت ویستراوە، ئەوانەی ڕووبەڕووی ڕووداوی خـەمناك دەبنـەوە، بـیر لـەوە بکەنـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ زۆر لـەوە خـراپتری بەسـەردا هاتووە، بەوە ورەیان بەرز ببێتەوە و هێزی خۆڕاگرییان زیاد بکا.

ئـەو ژیانـەی ئـەو ژیـاوە، ئـەوە پیشـان دەدات کـە سـەرکەوتن و کامەران بوون تەنها بە وابەستە بـوون بـە خـوداوە دێنـە دی. پـارە و پایە گرنگ نین. دەروونێك بە بـاوەڕ پـاراو کرابێـت، لـە گشـت ئەمانـە بەهێزترە.

دەشـێ بـە بـاوەڕێکی پتـەو، ناخۆشـییەکان وەرچـەرخێن بـۆ خۆشیی. ئەوانەی داکۆکی لە زاتی حـەق و حەقیقـەت دەکـەن، بـا لـە خۆشییە کاتییەکانی دونیاش مەحرووم بـن، بـەڵام چـێژی شـادییەکی هەتاهەتایی دەکەن.



دونیا جێی
ناڕەحەتی و ئازارو
ماندوێتییە.
خۆشیی و پشوودان
لە ڕۆژی دواییدایە.

پێغەمبەر ﷺ ڕووبەڕووی بەهێزترین و زەنگینترین و زاڵمترین کەسان بووەتەوە، سەرەنجامیش بەسەریاندا زاڵ بووە. ئا بەم جۆرە ئەوەی پیشانداوە کە ئەوەی دەیباتەوە باوەڕە. ئەگەر خۆیشی لە ڕووی ماددییەوە بەهێز و دەوڵەمەند بوایە، ئەوە ڕوون نەدەبووەوە کە بە یارمەتیی خودا و بە هێزی ئەو سەرکەوتووە. ئەوە دەرنەدەکەوت کە لایەنی براوە حەق و حەقیقەت و ئیمانە. ئەمە لە کاتێکدا کە ئەو کەسە بەهێز و دەوڵەمەند و لە ڕووی ماددییەوە بەرزانەی لە دژی وەستاونەتەوە، وێڕای ئەو هەموو زوڵم و زۆرەی کردوویانە، دۆڕان بەشیان بووە. بەم جۆرە باڵایی باوەڕ بەجوانی بۆ خەڵکی ڕوون بووەتەوە. هەر وەك ئەوەش ڕوون بووەتەوە کە

سەروەت و دەسەلآت و هێزێك كە خزمەتی حەقیقەت نەكات، داد نادات.

كەچی پێغەمبەر ﷺ كە بە نەبوونی ژیاوە و شانازیشی بە هەژارییەوە كردووە، بە ژیانی خۆی ئەوەی پیشانداوە كە ئەوەی گرنگ و باقییە، دەوڵەمەندیی ڕۆژی دواییە.

ئەوەش ڕاستییەكی گرنگە كە خودای گەورە "بەندەیەكی خۆی خۆش بوێت، یان ئەو بە دڵ لە دونیا زویر دەكات، یانیش دونیا لەو زویر دەكات". بەم شێوەیە ڕووی لە دونیا وەردەچەخێنێ و بۆ لای ڕۆژی دوایی و بەرەو بەدەست هێنانی ئەوێ، ئاڕاستەی دەكات. پێغەمبەری خوداش ﷺ كە لە هەموو كەس باشتر ئەم ڕاستییەی زانیوە، شەقی لەو دەوڵەندییانەی دونیا هەڵداوە كە هاتوونەتە بەر پێی و بە ویستی خۆی خۆشیی پەسلآنی هەڵبژاردووە. گرنگیی بەوە داوە كە باقییە نەك ئەوەی كاتییە.

# ژیانی پێغەمبەرﷺ

## بوونی ڕۆژی دوایی دەسەلمێنێت

ئـــەو هەڵســـوکەوتانەی پێغەمبـــەر ﷺ، بـــوونی ڕۆژی دوایـــی دەسەلمێنن. ئـەوە بـەیان دەکـەن کـە دونیـا شـوێنی کـار و کێڵگـەی پەســـڵانە. هـــەواری هـــەقیقیی چـــێژ و خۆشـــیی و دەوڵەمەنـــدیی، بەهەشتە. ئەوەی لێرە دەیچێنین، لەوێ دەیدوورینـەوە. ئـەو ئـازار و ناڕەحەتیی و ناهەقییانەی لە دونیادا دەکێشرێن، وا لـە مـرۆڤ دەکـەن شـایانی چـوونە بەهەشـت بێـت. خـۆ کـەیف و سـەفا و خۆشـییەکانی دونیا، گشت سنووردارن و بە ناخۆشـیی تـەنراون. خۆشـیی پوخـت و چێژی بێ تاڵیی، تەنها لە بەهەشتدا هەن.

پێغەمبەر ﷺ بە بەرگە گرتنی ناخۆشییەکان، هێزی خۆڕاگریی بـە ئێمەش دەبەخشێت بۆ بەرگەگرتنی ناخۆشـیی و نەهامەتییـەکان. بـە



دونیـــا شـــوێنی کـــار و کێڵگـەی پەسـڵانە. هـەواری هـەقیقیی چـێژ و خۆشـیی و دەوڵەمەنـدیی، بەهەشـتە. کــــەیف و خۆشــــییەکانی دونیا، گشت سنووردارن بـە ناخۆشی تەنراون.

بینینی ئەوەی بەسەر ئەودا هاتووە، بۆمان دەردەکەوێت ئەوەی بەسەر ئێمەدا دێت، چەند کەمە.

مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەبەرانبەر مەرگیشدا، هێز بە ئێمەومانان دەبەخشێت. لەوە تێدەگەین کە مردن پاسەپۆرتێکە بۆ چوونە ناو جیهانی پەسلاّنەوە. وەك چۆن بیر کردنەوە لەو شتانەی بەسەر ئەودا هاتوون ئازارەکانمان کەم دەکاتەوە، ئاواش تێڕوانینی ئەو بۆ مردن، ترسی ئێمە کەم دەکاتەوە. شاعیر چەند جوانی وتووە:

ئەمەیە هەواڵی دونیای ئەوبەر
مردن خۆش نەبوا، دەمرد پێغەمبەر؟

## بۆچی پێغەمبەر ﷺ بێباوك و بێناز بوو؟

لە کۆتایی وانەکەماندا ڕاسم خالێکی گرنگی بیر خستینەوە:

– مامۆستا! هەموو ئەوانەی فەرمووتان زۆر ڕاست و جوانن... لێ باسی ئەوەت نەکرد بۆ پێغەمبەرمان ﷺ بێ باوك و بێناز بوو؟

– ڕاستە، ئەوەم بیرچوو. ئەگەر حەز بکەن و کەمێك دان بەخۆدا بگرن، ئەوەشتان بەکورتی بۆ باس دەکەم.

سەیرم کرد هەموویان حەزیان لێیە. دەستخۆشیم لێکردن بۆ ئەو تامەزرۆییەیان کە لە خۆشەویستیی پێغەمبەری خواوە ﷺ سەرچاوەی گرتبوو. ئینجا پێم وتن:

– بەر لە هەر شتێك، بێ دایك و باوك مانەوەی پێغەمبەر ﷺ کە خۆشەویسترین بەندەیە لای خودا، دڵ دانەوەیەکی باشە بۆ ئەوانەی لە هەمان ئەو حاڵەتەدان. دەشبێتە هۆی کەم کردنەوەی خەمی بێ باوانیی.

ئەوانەی کە لە دایك و باوکیان بوونە، کاتێك لە ژیننامەی حەزرەت ﷺ دەڕوانن، بێ ئومێدیی دەخەنە لاوە و شەوقێك وەردەگرن بۆ خۆئامادەکردن بۆ ئایندە. لەوە دەگەن کە با لە پشتیوانیی دایك و باوکیش بێبەش بن، هەر دەتوانن ئایندە بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن.

خودای گەورە دایك و باوکی لە پێغەمبەر ﷺ سەندووەتەوە، وەلێ بە دەستی خۆی پەروەردەی کردووە و پێی گەیاندووە. ئەوەش گومانی تێدا نییە کە سۆز و بەزەیی پەروەردگار، زۆر لە هی دایك و باوك هەیە زیاترە. ئەوەی ئەو بدۆزێتەوە، هەموو شتێك بەدەست دێنێ و ئەوەی ئەویش ون بکات، هەموو شتێکی لەدەست دەچێت.

پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکیدا دەفەرمووێت: "أدّبني ربي، فأحْسَنَ تأديبي" واتە: "پەروەردگارم پەروەردەی کردم و بەجوانیش

پـەروەردەی دام". ئەمـەش پایەیەکـە زۆر لـە پێـدرانی دایـك و بـاوك بەرزتر.

ئێمە وەك موسوڵمان، باوەڕێکی تەواومان بـە بـوونی ڕۆژی دوایـی هەیە. بۆیە لای ئێمە، بێبەش بوون لـە سـۆز و خۆشەویسـتیی دایـك و باوك لە ژیـانی دونیـادا، بێبـەش بـوونێکی هـەتا هـەتایی ناگەیـەنێت. ئەوەی لێرە لە کاتێکی زوودا لەدەستماندراوە، خوا یار بێت لە جیهانی جاویدانیدا، بـەجۆرێك دەسـتمان دەکەوێتـەوە کـە ئـیدی لەدەسـتمان نەچێتەوە.

خاڵێکی دیکەی گرنگ لەم باسـەدا ئەوەیـە: ئەگـەر دایـك و بـاوکی پێغەمبەر ﷺ لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیی ئـەودا بژیانایـە، ترافیکـی ڕێز و خۆشەویستی بەتەواوی دەشێوا. خۆشەویستیی دایـك و بـاوك و خۆشەویستیی خودا بەیەکیاندا دەدا. چـونکە موسـوڵمان لەسـەریەتی لـەدوای خـوا، پێغەمبـەری لـە هـەموو کەسـێك زیـاتر خـۆش بـویَ و حیسابی بۆ بکا. دیسانەوە موسوڵمان لەسەریەتی لـە هـەموو کەسـێك زیاتر دایك و باوکیی خۆش بوێت. فەرمانی بەسـەردا دراوە دوای خـوا گوێڕایـەڵی دایـك و بـاوکی بێـت. کەچـی پێغەمبـەر ﷺ لـە مـەقامێکی وادایە کە دەبێت لە دایك و باوك زیاتر خـۆش بویسـترێ و گوێڕایـەڵیی بکرێت.

پەروەردگاری مەزن بە بردنەوەی دایك و باوكی پێغەمبەرﷺ لە كاتی منداڵییدا بۆ جیهانی ئەبەدییەت، لەو نەسازییە پاراستوویەتی. دەتوانین ئەمە بەم نموونەیە باشتر ڕوون بكەینەوە:

بیر لە كوڕ و باوكێك بكەنەوە كە سەربازن. ئەگەر پلەی كوڕەكە لە هی باوكی بەرزتر بێت، چی ڕوو دەدات؟ كوڕە لەسەریەتی ڕێز لە باوكی بگرێت، هەر چی باوكەشە، بەهۆی پلەكەیەوە، ئەركە لەسەری بەتەواوی گوێڕایەڵیی كوڕەكەی بكات... دۆخێكی چەند دژوارە، وا نییە؟

ئینجا خۆ ئەگەر دایك و باوكی پێغەمبەرﷺ لە كاتی پێغەمبەرایەتییدا هەبوونایە، نەیاندەتوانی بەشدار بن لەو نارەحەتییانەی بەسەردا ئەودا دەهاتن. لەم گۆشەنیگایەوە، دەتوانین بڵێین ئەوەی كە كۆچی ئەوان بۆ ڕۆژی دوایی زۆر زوو پێش كوڕەكەیان كەوتووە، نیشانەیەكی ڕەحمی خودایە.



# ئایا شەیتان دەتوانێ خێر بەدەست بێنێ؟

## هەموو کەسێك لە ڕۆژی دواییدا پاداشتی کردەوەکانی وەردەگرێتەوە

﴿بێگومان شەیتان تەنها بۆ ئەوە بانگی دەستە و تاقمەکەی دەکات، تا ببنە ئەهلی دۆزەخ﴾
فاطر/٦

یەکێك لەو لایەنانەی گەنجانی ئەمڕۆمان کە زۆر کەیفم پێدێ، ئەوەیە کە بیردەکەنەوە و ئەوەی بیری لێدەکەنەوە دەیلێن. مەراق لە شتان دەدەن، بیردەکەنەوە و دەیانەوێت تێبگەن. لەباتی ئەوەی گوێیان لە چی بوو باوەڕی پێبکەن، دێن شەنوکەوی دەکەن و بەدوای بەڵگەدا دەگەڕێن و هەوڵ دەدەن بگەن بە ڕاستی.

من ئەم هەڵسوکەوتەی گەنجەکانمانم زۆر بەدڵە. چونکە بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوە، لە بنچینەدا فەرمانێکی قورئانە. چەندین

ئایەت هەن داوامـان لێدەکـەن بیربکەینـەوە و ئـەقڵمان بخەینـە گـەڕ. پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: "یەك کاژێر بیر کردنەوە، لە شەسـت سـاڵ پەرستشی نافیلە (سوننەت) باشترە".

لە پـۆلی نۆیـەمی بنـەڕەتی و لـە وانـەی ئاینـدا بـووم. باسمـان لـە دادگەریی خودا دەکـرد. ئـەوەم بـۆ ڕوون دەکردنـەوە کـە بچـووکترین چاکە و خراپەکارییش، بێ بەرانبەر (پاداشت یان سزا) نامێننەوە.

گەنجان باسیان لەوە دەکرد کە دادگەری بە جۆرێك لـە جۆرەکـان لە دونیادا بەدینایات.

– ئاخر بۆیە بوونی ڕۆژی دوایی گرنگە. تەنها لەوێـدا، هـەر کەسـە چ هەقێکی هەیە، وەریدەگرێتەوە... ئەوانەی لێـرە لـە سـزا ڕزگاریـان دەبێت، یان ئەوانەی لێرە ناتوانن پاداشتی چاکەکانیان وەربگرنـەوە، لەو دونیایەی تردا بەرانبەری ئەوەی کردوویانە وەریدەگرن. باش نییە قیامەت هەیە؟! ئەگەر نا زۆر ناهەقی لای ئەو کەسانە دەمایـەوە کـە دەیانکرد...

خـودای گـەورە، وەك چـۆن کـارە باشـەکانمان بـەخێر پاداشـت دەداتەوە، ئاواش ئەو کـارە باشـانەی کـە ئێمـە بووینەتـە هۆکاریـان، هـەر بـەرز دەینرخێنێـت. بێگومـان ئەوانـەش کـە بوونەتـە هۆکـاری خراپەکاریی، گوناهیان دەگاتێ. بۆیە وەك چۆن نـابێ خراپـە بکـەین، ئاواش نابێ ڕێگە خۆش بکەین بۆ ئەوەی کەسانی تر خراپە بکەن.

که قسەکانم بەمە گەیشت، (ئەنەس) کە یەکێك بوو لە قوتابییە ژیرەکانی پۆل، پەنجەی بەرز کردەوە:

– مامۆستا! ئەگەر بەهەڵە تێنەگەیشتبم، وا بزانم وتتان ئەوەی لەم دونیایەدا ببێتە هۆی کارێکی چاك خێری دەگاتێ، وایە؟

– بەڵێ، پاداشت یان سزای ئەو چاکە یان خراپانەی دەبینە هۆکاریان، وەریدەگرین.



– ئایا ئەمە بۆ هەموو کەسێك وایە؟

– بێگومان، بەڵێ...

– باشە، بۆ شەیتانیش هەر وایە؟

– بێگومان بۆ شەیتانیش هەر وایە. سزای ئەو کارە خراپانەی بووەتە هۆکاریان وەریدەگرێت.

ئەنەس ڕەفتاری گۆڕا. لە چاوەکانیدا ژیری دەچۆڕا.

– باشە کە وا بێت، ئایا شەیتان بۆ ئەو کارە باشانەی دەبێتە هۆکاریان، خێر بەدەست دەهێنێت؟

بەم پرسیارە، پۆل گرژیی تێکەوت. هاوڕێکانی ئەنەس بابەتەکەیان باش هەرس نەکردبوو. کەوتنە هات و هاوار: شەیتان چۆن خێر بەدەست دێنێ؟!

- بوەستن گەنجینە! با جارێك بۆمان ڕوون ببێتەوە ئەنەس دەیەوێت بڵێ چی، دوای ئەوە هەر کەسە با بۆچوون یان ڕەخنەی خۆی بڵێت.

گشت پۆلەکە بەمەراقەوە لە ئەنەسی دەڕوانی. بەڵام ئەو بە بڕوا بەخۆبوونەوە وتی:

- مامۆستا! لەوانەی ڕابردووشدا باسمان لەوە کرد کە ئەوەی ببێتە هۆی کارێك، وەك ئەوە وایە خۆی کردبێتی. بەپێی ئەم ڕێسایە، هەر کەسێك ببێتە هۆکاری هەر شتێك، ئیللا پاداشتەکەی وەردەگرێت. دیسان هەر جەنابتان وتتان شەیتان بەردەوام مرۆڤ بۆ خراپەکاریی بانگ دەکات، تۆوی خراپە لە ناخماندا دەڕوێنێت. ئێ ئەگەر بێت و گوێی لێنەگرین و نەکەوینە شوێن ئەو گوناهانەی دەیانخاتە ناخمانەوە و، بە تەعبیری جەنابتان هەر کات نزیکمان کەوتەوە شەقێکی تێهەڵدەین و لە خۆمانی دوور بخەینەوە، ئەوە خێر و پاداشت بەدەست دێنین.

بەو پێیە، شەیتان دەبێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی ئێمە خێر بەدەست بێنین. باشە بەم پێیە بێ، شەیتان بەوەی بووەتە هۆی ئەوەی خێر و پاداشت بەدەست بێنین، ئایا شەیتانیش خێرێکی پێنابڕێ؟

ئەو سەرسوڕمانەی بەهۆی ئەم پرسیارەوە پۆلی گرتەوە، لە ماوەیەکی کەمدا جێی خۆی بۆ بیرکردنەوە چۆڵ کرد. بە بیر

کردنەوەیەکی ڕاستیش، پرسیارەکەی ئەنەس وەڵامەکەی خۆی وەرگرت. ئەو وەڵامەی هەموو پێکەوە دۆزیمانەوە، دەکرێ بەم شێوەیە پوخت بکرێتەوە:

– بەڵێ، بەڕاستی شەیتان دەبێتە هۆی ئەوەی کەسە باشەکان خێر و پاداشتیان چنگ بکەوێ. ئەوانەی گوێی بۆ ناگرن، ئەوانەی ناچنە ژێر بارییەوە، ئەوانەی ئیعتیبار بۆ ئەو گوناهانە دانانێن کە ئەو بانگەوازیان بۆ دەکات، خێریان دەست دەکەوێت. بەڵام کاتێک شەیتان مرۆڤەکان بۆ گوناه بانگهێشت دەکات، مەبەستی ئەوەیە لەخشتەیان بەرێ و تووشی گوناهیان بکات. واتە نیازی گڵاوە. کاتێکیش مرۆڤەکان ئەو گوناهانە ناکەن، ئەو تووڕە دەبێ و قاری دێت. هەر بۆیە شەیتان هیچ پشکێکی لەو خێرانە بەرناکەوێت کە بەهۆی گوێ لێنەگرتنییەوە بەدەست دەخرێن. بەڵکو بەپێچەوانەوە لە هەر بانگهێشت کردنێکیدا، جا ئەنجامەکەی گوناه بێت یان خێر، ئەو زیانی بەردەکەوێت. چونکە نیازی ئەو زیان گەیاندنە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: "إنّما الأعمال بالنيّات" واتە: "کار و کردەوەکان بەگوێرەی نییەتەکان وەردەگیرێن". شەیتانیش بەو نییەتەی هەیەتی، لە هەر کار و موداخەلەیەکیدا تەنها گوناهی زیاد دەبێت و بە هیچ جۆرێك خێر بەدەست ناهێنێت.

با بە نموونەیەك ئەمە ڕوون بکەینەوە:



بـير لــه شــوفێری تەكســيیەك بكەنــەوە. نەفــەرێك هەڵـدەگرێ كـە هەردوو چاوانی نابينـان... زۆر خێـرا لێدەخوڕێ و گوێ بە هيچ ياسـايەكی هاتوچۆ نادات. ئەم شوفێرە ئەوەی دەيكـا لەبـەر كـەيف و هەوەسـی خۆيـەتی نــەك ئــەوەی ڕێبــوارە نابيناكــە زوو بگەيەنێتــە شــوێنی مەبەسـتی. بـەڵام ئـەم پابەنـد نەبوونـەی بـە ياسـاكانی هاتوچـۆ، بـە ئەنجامێكی جەرگبڕ كۆتايی دێـت. ڕووداوێكـی گـەورە دەخاتـەوە. بـە ماشێنە بوو بە داشقەكەی، ڕێگاكە دادەخات. وەلێ لە ئـەنجامی ئـەم ڕووداوە ترسـناكەدا، موفاجەئەيــەك ڕوو دەدات. ڕێبــواری نابينــا، چاوەكانی دەكەونەوە بينين.

ئێستا با بيرێك بكەينەوە: ئايا ئەم شوفێرە خـەڵات دەكـرێ لەبـەر ئەوەی بووەتە هۆی ئەوەی ڕێبوارەكە بينايی بۆ بگەڕێتەوە؟

— نــەخێر، بەپێچــەوانەوە. لەبــەر ئــەو تامپۆنــەی ئــەو بووەتــە هۆكـاری، سـزا دەدرێ. چـونكە ئامـانجی ئـەو ئـەوە نـەبووە چـاوی سەرنشينەكە بكاتەوە، بەڵكو بۆ كەيف و تێركردنـی ئـارەزووی خـۆی بووە.

لــەو كارانــەی دەيانكــەين، نيیــەت زۆر گرنگــە. لــە هەنــدێك ڕووبەڕووبوونەوەی وەرزشيدا، سەرنج دەدەين هەندێ جـار ناوبـژيوان

هەمان هەڵە بە شێوازی جیا دەنرخێنێ. هەندێ جار سزای ئەنجامدەر دەدات و هەندێ جاریش هەر یارییەکەش ڕاناگرێ.

- بۆ؟

- چونکە ناوبژیوان سەیری نییەتی یاریکەرەکە دەکات. ئەگەر بزانێ بە قەستیی وای نەکردووە، سزای نادات. بۆ نموونە لە تۆپانێدا، ئەگەر بێت و یاریکەر دەست لە تۆپ بدات، سزا دەدرێت. بەڵام ئەگەر تۆپەکە بێت و بێ ویستی یاریکەرەکە بەر دەستی بکەوێت، ئەمە بە هۆیەك دانانرێت بۆ سزادانی.



بەڵێ لەو کارانەی دەکرێن، نییەت زۆر گرنگە. بۆیە لە پەرستشەکانمان وەك نوێژ و ڕۆژوو، نییەت هێنان یەکێکە لە مەرجەکان. پەرستشێك نییەتی لێنەهێنرێ یان بەهەڵە لێی بهێنرێ، وەرناگیرێ.

لەبەر ئەوەی نییەتی شەیتانیش هەردەم یاخی بوون لە خودا و تووش کردنی مرۆڤە بە گوناه، ئەوە پاداشت کرانی هەر هی باس کردن نییە.

وێڕای ئـەوەی شـەیتان لـە دۆزەخـدا مـەحکوومی بەنـد کردنێکـی بەسۆی هەتاهەتاییە، لێ سزای ئیعدام واتە لەناوبردن نادرێت.

بەم جۆرە شەیتانیش مافی مانەوەی پێـدراوە، هـەم لـەم دونیـا و هەمیش لەو دونیا. لە دۆزەخیشدا بێت، مانەوە چاکترە لە نەمان.

دەمەوێت لێرەدا شـتێك ڕوون بکەمـەوە کـە زۆر پـێم گرنگـە، هـەر چەندە پەیوەندیی بـە بابەتەکەشمانـەوە نییـە... نابێـت قسـووریی و گوناهباری، مرۆڤ لە پاڕانەوە لـە خـودا بکـەن، بـەڵکو بەپێچـەوانەوە دەبێ ببنە مایەی زیادکردنی نزا و لاڵانـەوە... نـابێ کـەس ئومێـد لـە خودا ببڕێ، بەڵکو دەبێت ئومێدی بـە بەخشـران هـەبێت و درێـژە بـە دوعا گوێی بدات...

چـــونکە خـــودای گـــەورە تەنانـــەت دوعـــای خراپترینـــی بەدیهێنراوەکانیش کە شەیتانە گیرا کردووە، کاتێك وتوویەتی:

﴿قَالَ أَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾- الأعراف:١٤، واتە: "(شەیتان) وتـی: مۆڵـەتم بـدە تـا ئـەو ڕۆژەی (گشـت نـەوەی ئـادەم) زینـدوو دەکرێنەوە".

# بێت و دان بەخۆدا بگرن

چەند دێڕە شیعرێکی هۆزانڤانێکی کلاسیکی چینی، قوتابییەکانم زۆریان بەدڵ بوو. ئیشەڵلا خوێنەرانیش هەروا بەدڵیان دەبێت:



ئەوانە بۆ فام ناکەن؟

بۆ میوە لێکردنەوە،

دارەکان بەرد باران دەکەن

بێت و دان بەخۆدا بگرن

ئەوان خۆیان دەکەونە خوارەوە...

بەدوای شتی بچووکا وێڵ دەبن

خۆیان تووشی هەناسەبڕکێ دەکەن

بێت و دان بەخۆدا بگرن

ئەوان خۆیان تەشریف دێنن...

چی بەو شەڕە بێمانایانە بڵێین؟

بەتایبەت براکوژی، ئاخر بۆ؟

بێت و دان بەخۆدا بگرن

ئەوان خۆیان گیان دەسپێرن...



# خۆ کاری من نییه..

## چەمکێکی دواکەوتوو و خۆپەرسانە

"خۆپەرسی شتێکە
هی نەفرەت لێکردنە."
(پاسکاڵ)

لە ئاینەکەماندا ڕێسا قەتعییەکان، فەرزەکانن. فەرز فەرمانی ڕاستەوخۆی زاتی خودایە.

**فەرزەکانیش دەکرێن بە دوو بەشەوە:**

**١- فەرزی عەین: ئەو پەرستشانەن کە دەبێت هەر کەسەو بۆ خۆی ئەنجامیان بدا. وەك نوێژ و ڕۆژوو... ئەم جۆرە پەرستشانە، کەس ناتوانێ لەجێی کەسی دیکە ئەنجامیان بدا.**

٢- فەرزی کیفایە: ئەمەش ئەو جۆرە پەرستشانەن کە لەسەر هەموو کەسێك واجبن. بەلاّم بە ئەنجامدانیان لەلایەن بڕێك لە موسوڵمانان، بەرپرسیارێتی لەسەر ئەوانی تر لا دەچێت. ئەوانەی ئەنجامی دەدەن، پاداشت وەردەگرن و ئەوانەش کە ئەنجامی نادەن گوناهیان ناگاتێ. نموونەیەکی ئەمەش نوێژی مردووە.

> لە مەملەکەتێکدا چوار کەس دەژیان. ئەم چوارە ناویان (هەموو کەسێك)، (کەسێکیان)، (هەر کامێکیان)، (هیچ کەسێکیان) بوو...
>
> ڕۆژێك کارێکی زۆر گرنگ هاتە پێشەوە... هەموو کەسێك دڵنیا بوو لەوەی کەسێکیان پێی هەڵدەستێت. گەرچی هەر کامێکیان دەیتوانی بیکات، بەلاّم هیچ کەسێکیان نەیکرد.
>
> کەسێکیان بەمە زۆر تووڕە بوو. چونکە کارەکە هی هەموو کەسێك بوو. هەموو کەسێك وای بۆ چووبوو کە ڕەنگە هەر کامێکیان هەڵسێ بە کردنی. بەلاّم هیچ کەسێکیان بیری لەوە نەکردبووەوە کە هەموو کەسێك نایکات.
>
> سەرەنجام، ئەم کارە کە هەر کامێکیان دەیتوانی بیکات، لەبەر ئەوەی هیچ کەسێکیان نەیکرد، هەموو کەسێکیان کەسێکیانی تۆمەتبار دەکرد...
>
> خوا بکات ئەم مەملەکەتە، ئەوەی ئێمە نەبێت.

بەلاّم ئەگەر بێت و کەس بەشداریی لە نوێژی مردووێکدا نەکات، ئەوە گشت ئەو موسوڵمانانەی لەو ناوچەیەدا دەژین، بەرپرسیار و گوناهبار دەبن.

موسولمانانی تێگەیشتوو، ئەو کارانەش کە ڕاستەوخۆ ئەرکی سەرشانی خۆیان نین، بەدڵسۆزییەوە لە ئەستۆی دەگرن. چونکە دەزانن لە کارێکی گرنگ بۆ کۆمەڵدا، "بە من چی؟" نەهاتنە جێی ئەو کارە دەگەیەنێت. بە لە ئەستۆگرتنی ئەو ئەرکانەش، خێری زۆر بەدەست دەهێنن.

زۆر جار کەسەکان، ئەو گرنگییەی بە کارە خودییەکانی خۆیانی دەدەن، بە کارە جڤاکییەکانی نادەن. ئەمە لە کاتێکدا، کە کارە جڤاکییەکانیش پەیوەندیی بەوانەوە هەیە. چونکە سوودی ئەم کارانە و زیانیشیان، هەر پەیوەندیی بە تاکە تاکەی مرۆڤەکانەوە هەیە.

بۆ نموونە: خەڵکی ئەو گرنگییەی بە پاك ڕاگرتنی ماڵی خۆیانی دەدەن، بە هی کووچە و کۆڵانەکانی نادەن. ئەمە لە کاتێکدا کە پاکژیی یان قرێژیی کۆڵان، بەر لە هەر کەسێك کار دەکاتە سەر ئەوانەی لەوێ دەژین. ئەوانەی زبڵەکانیان فڕێ دەدەنە کۆڵانەوە، خۆپەرسییان دەسەلمێنن نەك پاکییان.

ئەم جۆرە کەسانە، بەردەوام چاوەڕێی ئەوەن ئەرکە جڤاکییەکان لەلایەن میریی و شارەوانی یانیش کەسانی ترەوە بێنە ئەنجامدان. وتنی: "بە من چی؟! با کەسانی تر خەمی لێبخۆن" تێگەیشتنێکی زۆر دواکەوتووانەیە. ئەگەر بێت و هەر کەسە و کارەکان بەوانی تر بسپێرێت، ئەوە ئەو کارانە هەرگیز ئەنجام نادرێن.

## تێگەیشتنی ماددەگەرانە

## مرۆڤەكان دەكات بە بەرژەوەندی پەرس

كە یەكێك دەبێت بە كەسێكی ماددی، ئیدی لە خزمەت گەیاندن هەڵدێت و تەنها و تەنها بیر لە خۆی دەكاتەوە و بەدوای بەرژەوەندییە تەسكەكانی خۆیەوە ڕادەكات. ئەمە لە حاڵێكدا، كە ئێمە هەموومان هاین لەسەر كەشتییەكدا. ئایا وەك چۆن لە كاتی پێشهاتنی مەترسییەكدا، گشت كەشتیوانانی سەر كەشتییەك هەموو پێكڕا دەكەونە هەڵپەی ڕزگاركردنی كەشتییەكە، ئێمەش لەسەرمان نییە دەست لەناو دەست بنێین بۆ ڕزگار كردنی ئەو كەشتیگەلەی وڵاتمان كە كونی تێبووە و ئاو دزەی تێكردووە؟ چونكە خوا پەنامان بدا، ئەگەر كەشتییەكە نغرۆ ببێت، ئەوە هەمووان زەرەرمەند دەبین و تیادەچین.

مەخابن هەندێك پەندمان هەن زۆر هەڵەن، وەك ئەوەی دەوترێ: "لە ئەركدا تەریك و لە مافدا شەریك". ئەم جۆرە كەسانە لە كاتی هاتنە ئارای كارێكدا، دەچنە ڕیزی دواوە و لە كاتی دابەش كردنی كرێشدا خۆیان دەخەنە ڕیزی پێشی پێشەوە.

هیچ كارێكی شێلگیرانە لەگەڵ ئەو كەسانەی هەڵگری ئەم بیر و بۆچوونەن، بەپایان ناگات. ئێ خۆ ئەو جۆرە خەڵكە تەمبەڵ و تەوەزەلە، سوودیان بۆ خۆیشیان نابێت.

ئەوانەی دەیانەوێت سوودبەخش بن بۆ خۆیان و وڵاتیان و گشت مرۆڤایەتیش، دەبێت لە کاتی خزمەت و کاردا لە ڕیزی پێشی پێشەوە و لە کاتی بەخشینی کرێ و بەخششیشدا لە ڕیزی دوای دواوە بن.

لە دەورانی کۆندا، شایەك ویستوویەتی بزانێت هەستی بەرپرسیارێتی لای گەداکانی ژێر قەڵەمڕەوییەکەی لە چ ئاستێکدایە. بۆیە داوایەکی لەم جۆرەی کردووە:

– دەبێت هەمووان ئەم شەو تا گزینگی بەیان شیر بێنن و لە حەوزە گەورەکەی نێو باخی کۆشکەکەمی بکەن...

تاریکی داهات و نەهات، گەداکان سەتڵی گەورە گەورەیان گرت بە دەستەوە و ڕووەو حەوزە گەورەکەی نێو کۆشك کەوتنە ڕێ.

بەیانی شا لەگەڵ تاریك و ڕووندا چووە بەلەکۆنی کۆشکەکەی تا سەیرێکی حەوزەکە بکات. تووشی حەپەسان و ئومێدبڕان بوو. چونکە حەوزەکە پڕ بووبوو لە ئاوێکی شێلوو نەك شیر.

بۆ؟!

لەبەر ئەوەی زۆربەی زۆری دانیشتووان وتبوویان: "کوڕە کێ بەم نیوەشەوە دەمانبینێ؟!" و لەبری شیر ئاویان لە حەوزەکە کردبوو... تەنها کەمێکیان فەرمانەکەیان بەجێ هێنابوو و شیریان بۆ هاوردبوو. بۆیەش حەوزەکە هەر بەقەد خوێی چێشت شیری تێچووبوو.



زۆرینــە وتبوویــان: "هــەر چــۆنێك بێــت هــەمووان شــیر دێــنن و ئاوەكەی ئێمە لەو بەینەدا ون دەبێـت"، لـێ تەقریبـەن كـەس شـیری نەهێنابوو.

بێگومان سەرەنجام هەمووان شەرمەزار بووبوون.

بۆ بنیات نانی وڵاتێكی بـەهێز، دەبـێ هاوڵاتیـان لـەبری: "بـە مـن چی؟" بڵێن: "بە من هەموو شتێك". وڵاتان بە: "ئەگەر كـەس نـەبێ، من هەم" توانیویانە لەسەر پێ بمێننەوە.

لە مێژووی ئێمەدا زۆر نموونەی جوان هەن لەسەر ئەمـە. لـە كاتـە زۆر ترسناكەكانی شەڕدا، ئەركی وا هاتووەتە گۆڕێ كە شـەڕڤانەكانی خســتووەتە لێــواری مــەرگ، ڕزگــاربوون زۆر زەحمــەت و ئەگــەری گەڕانــەوەش وەك بڵێــی نــەبووە. كاتێــك فەرمانــدەكان بــەدوای

کەسانێکدا گەڕاون بۆ ئەم ئەرکە سەختانە، تووشی حەپەسان هاتوون. چونکە ئەوەندە گیانباز هاتوونەتە پێشەوە، کە لە دابەش کردنی ئەرکەکاندا گێرمە و کێشە و دەمەقاڵەش کەوتووەتە نێوانیانەوە.

بێگومان ئیلهامی ئەمەش لە پێغەمبەر ﷺ و یارانییەوە سەرچاوە دەگرێت.

چونکە لە سوپاکەی ئەودا، تەنانەت منداڵەکانیش خولیای جیهادیان لە دڵدا بووە. بۆیە ئەو منداڵانەی پێغەمبەرﷺ پێی باش نەبووە لە شەڕ بەشدارییان پێبکرێت، خەمبار بوونە و ڕێوشوێنی جیا جیایان گرتووەتە بەر بۆ ئەوەی لە بڕیارەکەی پەشیمانی بکەنەوە.

مرۆڤ بەم هەستانە، بنکەی مەعنەوییاتی بەرفراوان و گەورە دەکات. چونکە کەسێك هەوڵ و خەباتی بۆ میللەتەکەی بێت، بە "میللەتێکی بچووکی خۆبەخۆ" دادەنرێت.

بەهای هەر تاکێك بەندە بەوەی هەوڵ بۆ چی دەدات. ئامانجی ژیانمان چەنێك بەهادار بێت، ئێمەش ئەوەندە بەهادارین. لەم سۆنگەیەوە، ئەوانەی تەنها لە پێناوی بەرژەوەندیی ماددی یان لە پێناوی خواردن و خواردنەوە و ڕابواردن دەژین، ئەوا بە دەستی خۆیان بەهای خۆیان دادەگرن.

بەڵێ، هەوڵ بۆ چی بدەن، ئەوەندە بەنرخن. بەرزیی بیر و بۆچوونەکانمان ئێمەش بەرز دەکاتەوە.

هەر بۆیە بەنرخترین کار ئەو کارەیە کە بۆ ڕازی کردنی خودا دەکرێت. چونکە سەرجەم دەستکەوتە دونیاییەکان دەڕۆن و نامێنن. هەرچی ئەوانەیە کە بۆ خودا دەکرێن، ئەوە وەك توێشوویەکی قیامەت دەمێننەوە.

لە دووەم جەنگی گێتیدا، ئەڵمانیا و هاوپەیمانانی تووشی دۆڕان هاتن و خۆیان بەدەستەوەدا. شەڕ کۆتایی پێهاتبوو، بەڵام یەکەیەکی بچووکی سەربازیی ئەڵمانیا، ئاگای لەم ئەنجامە نەبوو، بۆیە بەردەوام بوو لە بەرگری و بەرەنگار بوونەوە. سەربازە ڕووسەکان کە لە هەر چوار لاوە گەمارۆیان دابوون، بە بڵندگۆ قسەیان بۆ کردن و داوایان لێکردن چەکەکانیان دابنێن و خۆ بەدەستەوە بدەن. لێ ئەڵمانیەکان داواکەیان ڕەت کردەوە. فەرماندە ڕووسەکە وتی:

– دەمێکە شەڕ کۆتایی پێهاتووە. ئەڵمانیا لە گشت بەرەکانەوە تێکشکا و تەسلیم بوو. ئێوەش خۆ بەدەستەوە بدەن، چونکە ئیتر شتێك نەماوە بە ناوی ئەڵمانیا!

هەرچی فەرماندە ئەڵمانییەکەشە، بەم شێوەیە وەڵامی دانەوە:

– مادام ئێمە لێرەین و هێشتا ماوین، ئەوا ئەڵمانیا هێشتا ماوە!

بەم شێوەیە بەردەوام بوون لە جەنگان.



کەسی بەرژەوەندیی پەرس و خۆپەرس لەو کەسە بێئەقڵە دەچێت کە ئەو چڵەدارە دەبڕێتەوە کە خۆی لەسەریەتی.

## پێویستە هەموو کەسێك ئەرکی سەر شانی جێبەجێ بکات

زۆربەی خەڵکی خۆیان و ئەو کارانەی دەیانکەن بەکەم دەزانن. دەڵێن "جا ئێمە چیمان پێدەکرێت؟". یانیش وا بیر دەکەنەوە "هەوڵدانی من چیی لێ شین دەبێت؟". ژمارەی ئەوانەش کە پێیان وایە "بەهار بە گوڵێك نایەت" کەم نییە.

ئەمە لە کاتێکدا کە بۆچوونی: "بەر لە هەر شتێك، پێویستە من ئەوەی لەسەر شانمە جێبەجێی بکەم" ڕاست و دروستە.

بۆچوونی: "ئەگەر کەس نەیکا، دەبێ من بیکەم"، پێگەیشتوویی کەسایەتیی مرۆڤ دەگەیەنێت.

هەندێك كار، چاوەڕوانی ڕچە شكێنێكە. چارەسەری زۆر دۆزی گەورە بە پێشەوایەتیی كەسێك دەست پێدەكات.

نابێ ئەوەمان بیر بچێت كە هەندێ جار مرۆڤ بە نالێك ئەسپێك ڕزگار دەكات. ئەسپێك سوپایەك و سوپایەكیش میللەتێك ڕزگار دەكات.

بەڵێ، نابێ بە هیچ جۆرێك مرۆڤ خۆی و ئەو كارەی پێی هەڵدەستێ بەكەم بزانێت.

گرنگ ئەوەیە، كام كار چاك و ڕێك و بەجێیە، ئەوە بكرێت.

ئەگەر ئەو كارەی دەیكەین ڕاست بێت، هیچ گرنگ نییە عەوامی خەڵك پێچەوانەكەی بكات. ئینجا چ جای ئەوەی ئەو كارە بریتی بێت لە ڕزگار كردنی ڕۆحێك یان خزمەت كردنی باوەڕ. ئەو كات بەهەند وەرنەگرتنی كەسانی تر، چ گرنگییەكی هەیە؟!..

ساڵی پار هەواڵێكم لە ڕۆژنامەیەكدا بەرچاوكەوت، زۆر پێی دڵگران بووم. لە (ئێمینۆنو) كە یەكێكە لە قەرەباڵغترین ناوچەكانی ئیستەنبووڵ، ژنە هەژارێك لە قەراغ شۆستەی شەقامێكدا لەناو ئازار دەتلێتەوە. خەڵكی ئەو دیمەنە جەرگبڕەیان بەرچاو دەكەوێت و بەسەریدا ڕادەبوورن. تەنها ژنە گەشتیارێك بەهانای ئەو ژنە داماوەوە دەچێت و یارمەتیی دەدات، كە زمانیشی نازانێت. مانشێتی ڕۆژنامەكەش زۆر سەرنج ڕاكێش بوو: "دونیا ئاوەژوو بووەتەوە؟".

بەڵێ، بەڕاستی ئێمە وا نەبووین. بۆ و لەبەر چی وامان لێهات؟

ڕۆژێکی تریش، خۆم لە هەمان شوێندا شاهێدی شەڕێك بووم. دوو گەنج لەیەکتریان دەدا. ئەو حەشاماتەی لە دەوریشیان کۆبووبوونەوە، لەباتی ئەوەی لەیەکیان جیا بکاتەوە، هاواری دەکرد: " لێیدە! لێیدە! لێیدە!". دەتوت سەیری فیلم ئەکەن، ئاوا شەڕکەرەکانیان هان دەدا.

ئەمە لە کاتێکدا کە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرمووێت: "مَن رءا مِنكم مُنكَرا فليغيِّره بِيدِه، فمَن لم يستطِع فبِلِسانه، و مَن لم يستطِع فبِقلبه، و ذلك أضْعَفُ الإِيمانِ"، واتە: "هەر یەکێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی، با هەوڵ بدا بەدەست ڕاستی بکاتەوە. ئەگەر پێی نەکرا، با بە زمان ڕێگریی لێبکات. خۆ ئەگەر ئەوەشی پێنەکرا، با بە دڵی ناپەسەندی بکات. ئەمەش نزمترین پلەی باوەڕە."

ئایەتێکی پیرۆزیش دەفەرمووێت: ﴿مَنْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَ مَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا﴾ – المائدة/٣٢، واتە: "ئەوەی کەسێك (بە ناهەق) بکوژێت، (واتە) لە (تۆڵەی) کوژرانی یەکێك یان (ئەنجامدانی) بەدکارییەك (ی گەورە) لەسەر زەوی نەبێت، ئەوە وەك ئەوە وایە تەواوی خەڵکیی کوشتبێت. ئەوەشی (کەسێك) لە مردن ڕزگار بکات، وەك ئەوە وایە تەواوی خەڵکیی لە مردن ڕزگار کردبێت".

موسوڵمانێکی تەواو، نەك مرۆڤ بەڵکو دەستی ناچێتە گیانی هیچ زیندەوەرێکیشەوە، هەموو شتێك بە جێدەست و بەرهەمی خودای گەورە دەزانێت. بۆیە هەموو بوونەوەرێکی گیاندار و بێگیان، تەنها ڕێز و خۆشەویستی و لا لێکردنەوە، لە موسوڵمانەوە دەبینێت.

لە کۆندا هەندێ لە خواناسان کە بە چیا و چۆڵ و باخ و باخاتدا تێدەپەڕین، خڕخاڵیان لە پێ دەکرد، تا لە کاتی ڕێ کردنیاندا مێرووەکان گوێیان لە دەنگی خڕخاڵەکانی پێیان بێت و دوور



بکەونەوە، نەوەکا ئازاریان پێبگا و بقڵیشێنرێنەوە...

باپیرانمان چەندین وەقفیان دامەزراندووە بۆ ئاسان کردنی ژیانی خەڵکی. لەپاڵ ئەم وەقفانەدا کە بە مەبەستی بەدەمەوە چوونی نەدار و دەردەداران دامەزرێنراون، بیر لە ئاژەڵانیش کراوەتەوە...

وەقفی وا هەبووە بۆ تیمارکردنی ئاژەڵە نەخۆش و بریندارەکان و ئەو ئاژەڵە کێوییانەی لە کەشە دژوارەکانی زستاندا برسیی دەمانەوە، دامەزرێنراون. پێغەمبەرﷺ ئاماژەی بەوە داوە کە کەسێك لەبەرئەوەی پشیلەیەکی بەندکردووە و بووەتە هۆی ئەوەی لە برساندا بمرێ چووەتە دۆزەخەوە، ژنێکیش لەبەرئەوەی ئاوی داوەتە سەگێك کە خەریك بووە لە تینوێتیدا بخنکێت، بووە بە بەهەشتی.

ئیسلام ئاینی سۆز و بەزەییە. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "من پێغەمبەری لێبووردەیی و بەزەییم، پێغەمبەری خەشم و تووڕەیی نیم". هەر بۆیە ئەوانەی چی ئەزیەت و ئازار هەیە داویانە و تەنانەت ئەوانەش کە ویستوویانە دەستیان بچێتە خوێنییەوە، عەفووی کردوون و هەرگیزا و هەرگیز بیری لەوە نەکردووەتەوە تۆڵەیان لێبکاتەوە. تەنانەت ئەوانەش کە بۆ کوشتنی هاتوون، لای ئەو بە کامەرانییەکی جاویدانی زیندوو بوونەتەوە.

# زۆر دەگۆڕێ

پیاوێکی گەنج بوو. لێ بە سۆز و بەزەییەوە گەورە بووبوو. لەو کەنار دەریا کاکی بە کاکییەدا بە ڕاك ڕاك خەریکی هەڵدانەوەی ئەو ئەستێرەی دەریایانە بوو بۆ ناو ئاوەکە کە کەوتبوونە سەر وشکانی، هەناسەبڕکێی بوو.

پیرە پیاوێك کە ماوەیەك بوو لەم دڵگەرمییەی دەڕوانی، چەندی دەکرد نەیدەتوانی مانایەك بۆ ئەو کارەی بدۆزێتەوە، هاواری کردێ:

– ڕۆڵە! ئەوە خەریکی چییت؟

– دوێنێ شەو گێژەڵووکە هەبوو. شەپۆڵەکان ئەو ئەستێرەی دەریایانەیان هەڵداوەتە سەر وشکانی. منیش دەمەوێت ڕزگاریان بکەم، بۆیە بەر لەوەی گیانیان دەربچێ، هەڵیان دەدەمەوە نێو دەریا.



مامە پیرە بە ئومێدبڕاوی و بزەیەکی تاڵەوە هاتە گۆ:

– بەلام ڕۆڵە! کەنارەکە چەندان کیلۆمەتر درێژ بووەتەوە... ئەستێرەکانی دەریاش ئەوەندە زۆرن، لە ژمارە نایەن... ئیتر چی لە مەوزووع دەگۆڕێ؟

کوڕە لاوەکە ئەستێرەیەکی لەسەر زیخەکە هەڵگرتەوە و هەڵیدایەوە نێو ئاوە فێنکەکەی دەریاوە و وتی:

– بەلام بۆ ئەمە زۆر لە مەوزووع ئەگۆڕدرێ...



# ماڵئاواییەکی خەمناك

## هەموو کۆتایەك، سەرەتایەکی نوێیە

"بێ ئەسڵ و فەسڵیی، لە هەموو بێناز
کەوتنێك زیاتر هی سك پێسووتانە"
(وەهبی وەققاس ئۆغلۆو)

ماڵئاوایی و لێکدابڕان زۆر کەم ڕێکدەکەوێت خەماویی نەبێت. بەڵام هەندێکیان زیاتر خەماوییە و زیاتر مرۆڤ دڵشکستە دەکات.

منیش لە ٢٨ی شوباتی ١٩٩٥ «ماڵئاوایی»یەکی زۆر خەمناکم کرد. لە قوتابییە زۆر خۆشەویستەکانم دابڕام، چونکە لەو ڕۆژەدا خانەنشین بووم.

بەڵام لەو ڕۆژەوە لە خۆشەویستیی ڕاستەقینەی خۆم بۆ قوتابییەکانم تێگەیشتم. ئەوەندە بیریان دەکەم و عەوداڵیانم!...

ڕاستییەکەی قەت پێشبینیی ئەوەم نەدەکرد ئەو خۆشەویستییەم ئەوەندە زۆرم بۆ بێنێ و بەو ڕاددەیە کارم تێبکات.

چەند ڕۆژ نەمتوانی لەژێر کاریگەریی ئەو دابڕانە بێمەدەر. چەند شەو بەدرێژایی شەو خەوم لێنەدەکەوت. خەویشم لێبکەوتایە، خەونم بە یادگارییە خۆشەکان لەگەڵ ئەواندا دەبینی. هەمدیس دەرسمان دەخوێند و پێکەوە قسەمان دەکرد.

کە سەرمام دەبوو، بە لا لێکردنەوە و خۆشەویستیی دەربڕینی ئەوان گەرم دەبوومەوە. بە سەردانەکانیان ئیسراحەتم دەکرد. بە یەك سڵاویان لە تەلەفۆندا، گوڕم بەبەردا دەهاتەوە. بە نامەکانیان بەخۆ دەهاتمەوە.

بەم جۆرە دووبارە بۆم دەردەکەوت ئەوان بوونە بە هەموو شتێکی من. دونیایەك ئەوانی تێدا نەبێ، بۆ من پڕ لە کەموکوڕییە...

ئیتر خوا یار بێت، هەوڵ دەدەم ئەو کەموکوڕییە لەڕێی نووسینەوە پڕ بکەمەوە. دەمەوێ چالاکیگەلێك ئەنجام بدەم، ئەمسەر بۆ ئەو سەری وڵاتمان وەك پۆلێك لێبکات. دەمەوێت بە هەموو قوتابییە کۆن و نوێیەکانم و ئەو خوێنەرانەی کتێبەکانم کە تەعاروفم لەگەڵ کردوون و ئەوانەی لەڕێی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەوە

سڵاوم لێکردوون و ئەوانەی کۆڕم بۆ گێڕاون، بە هەموو ئەمانە و گشت کەسێکی تریش بێژم سڵاو.

دەمەوێ ببەخشم و وەربگرم. گەرەکمە فێر ببم و فێر بکەم. بەتایبەتی پەرە بە خۆشەویستی بدەم، کە ئەمڕۆ لە هەموو کاتێک زیاتر پێویستمان پێیە. بەم جۆرە دەمەوێ ئەوەی پێشتر لە پۆلێکی بچووکدا کردوومە، لەمەودوا لە سەرتاپای وڵاتدا بیکەم.

دڵنیام "فێر بوون لە بێشکەوە تا گۆڕ" و بەخشینەوەی ئەوەی فێر بووینە بە دۆستان و ژیان لەو کەشی ئاسوودەیی و ئارامیی و ڕێز و خۆشەویستییەی بەشدار پێکردنی خەڵکی دەیدات، خواستی هەر هەموومانە...

بۆیە من وا هەست ناکەم خۆم لە مامۆستایەتی دابڕیبێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە، خۆم وا دەبینم کە خۆم بۆ پەروەردە و فێرکردنێکی بەربڵاوتر تەرفیع پێکردووە.

ئێستا لەگەڵ ئەوەدا کە هەموو شوێنێك وەك پۆل و هەموو کەسێکیش وەك خوێندکار دەبینم، خۆشم وا دەبینم کە دەستم بە فێربوون کردووە و زۆر شتم لەپێشە فێریان ببم. لە هەوڵی ئەوەدام خۆم بگەیەنمە خێرایی برا و خوشکە گەنجەکانم. من سوود لە هەست و بیر و بۆچوونی ئەوان وەردەگرم. چونکە لەڕێی ئەوانەوە خۆم نوێ دەکەمەوە و خۆم ڕزگار دەکەم لەوەی لە ژیان دوور بکەومەوە.

هەڵسان و دانیشتن و گفت و لفت لەگەڵ گەنجاندا، دەبێت بە پێکوتە (لقاح)ی گەنجیی بۆ مرۆڤ، و جۆش و خرۆش و توانا زیاد دەکات. بەردەوام پێشنیازی ئەمە دەکەم بۆ گشت دۆستەکانم لە هەر تەمەنێکدا بن. قسەکردن لەگەڵ گەنجان و بەتایبەت تێگەیشتوو و پێگەیشتووەکانیان، خۆش ویستنی ژیان بە بەساڵاچووان دەبەخشێت.

گەنجانیش لەم جۆرە پێکەوە دانیشتنانە ئەزموون وەردەگرن و ئیتر ڕزگاریان دەبێت لەوەی خۆیان هەموو شتێك تاقیی بکەنەوە. بۆیە وتراوە: "ژیر ئەو کەسەیە کە لە ئەزموونی کەسانی دی پەند وەردەگرێت"... گەنجان چارەنووسی تەمەنێکی درێژ و ئەو دەرسە جوانانەی لێی وەردەگرن، زۆر بەئاسانی و بێ هیچ زەحمەتییەك دێتە بەر دەستیان.

پەندێکی فەرەنسی هەیە دەڵێت "گەنجان بیانزانیایە و پیرانیش بیانتوانیایە". چارەی هەموو مەسەلەیەك بەوە دێتە دی کە بتوانین گەنجانێك بزانن و پیرانێکیش بتوانن بەیەك بگەیەنین...

ئەگەر گەنجان بتوانن سوود لە ئەزموونی پیران وەربگرن و پیرانیش هێز و توانا لەوان وەربگرن، ئیتر پرسگرێك نامێنێت. ئەگەر وا نەبێت، ئەو سا گەنجان دەڵێن: "یەڵڵا گشت پێکەوە بۆ دووبارە

دۆزینەوەی ئەمریکا" و پیرانیش لە بن دیواراندا درێژە بە تەنهایی خۆیان دەدەن.

ئەم حاڵەتە لێکدابڕانی نەوەکان و تێکچوونی شیرازەی کۆمەڵ دەگەیەنێت. چونکە ژیان بریتییە لە بەردەوامیی. هەر نەوەیە و ناچارە سوود لە ئەزموونی نەوەکانی پێش خۆی وەربگرێت و بەرەو پێشڤە بچێت.

بۆیە گەنجان نابێت پیران بەکەم بزانن، پیرانیش دەبێت هەوڵ بدەن لەوان تێبگەن.

بێ ئەسڵ و فەسڵیی، لە هەموو بێناز کەوتنێك زیاتر هی سك پێسووتانە. ئێمە لەسەرمانە نوێنەرانی "داهاتوویەك بین، ڕیشەکەی لە ڕابردوودا بێت". وەك چۆن بنچینەی ئەمڕۆ دوێنێیە، ئاواش بنچینەی سبەینێ ئەمڕۆیە. بەتەمەنەکان ڕابردوومان و کەمتەمەنەکانیش ئایندەمانن.

حەزرەتی عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) دەفەرموویت: "منداڵەکانتان بەپێی سەردەمەکەی خۆتان نا، بەڵکو بەپێی ئەو سەردەمەی خۆیان تێیدا دەژین پێبگەیەنن". لەم گۆشەنیگایەوە ئەو دایك و باوکانەی هەموو شتێك بەپێی بۆچوون و سەردەمی خۆیان هەڵدەسەنگێنن، ئایندەی منداڵەکانیان لێڵ دەکەن.

دەبێت هەموو شتێك بەپێی ئاینده ڕێکبخرێت، گەنجانیش بۆ ئاینده ئاماده بکرێن. بەڵام نابێت ئەوەشمان بیربچێت کە بناغەی ئاینده لە ڕابردوودا لێدەدرێت. بە هیچ دانانی ڕابردوو واتە ئاینده خستنە مەترسییەوە.

بۆ ئەوەی پەیوەندیی نێوان نەوەکان نەپچڕێ، دەبێت پەروەردەکاران خانەنشین نەبن. بە گوزارشتێکی دی، دەبێت هەموو تاکێك پەروەردە بە کاری خۆی بزانێت و تا ئەو ڕۆژەی دەمرێت، ئەوەی کۆی دەکاتەوە بیگوازێتەوە بۆ نەوەی دوای خۆی. هەر بۆیە من خۆم وا دانانێم خانەنشین بووبم. خانەنشینیم تەنها ڕەسمیاتێکە بەسەر کاغەزەوە.

کە بەم هەستانەوە بە قوتابییەکانم دەڵێم: "ماڵئاوا"، دڵتەنگییەکەم کەمێك کەم دەبێتەوە. دەمەوێت لەمە بەدوا پتر لێیان نزیك ببمەوە و وەك دۆستی یەکتر درێژە بە پێکەوەییمان بدەین.

بیر لەوە دەکەوە ببم بە پردێك، پردێکی خاکیی کە لاوان بەسەریدا بەرەو ئایندەیەکی ڕوون و گەشتر بپەڕنەوە... تەواوی ئامانجی من ئەمەیە. کۆشش دەکەم بۆ ئەوەی پەیوەندیی لەنێوان ئەوان و هاوتەمەنەکانمدا ببەستم. قەناعەتم وایە بە خۆشەویستیی، دەتوانم ئەو ئەرکە قورسە بەجێ بگەیەنم. ئەوان جگەرگۆشەی ئێمەن... ئەوان گیانمانن، جگەرمانن، ئایندەمانن.

له چاکەی گەنجەکانمان و لـە خراپەشـیاندا، ئێمـە ڕۆڵـی گرنگمـان هەیە. چونکە ئەوان لە زۆر ڕووەوە بەرهـەمی ئێمـەن. بۆیـە پێویسـتە لەسەرمان، کاتێك ڕەخنە لە هەڵەکانیان دەگرین، بەسۆز و بەویـژدانتر بین. بێگومان کاتێك ئەوانیش هەڵسەنگاندن بـۆ ئێمـە دەکـەن، دەبـێ بارودۆخی پێشان لەبەر چاو بگـرن و لـەجێی تۆمـەتبار کـردن، پەنـد لێوەرگرتن و دووبارە نەکردنەوەی هەڵەکان، بکەنە ئامانجیان.

هـەموو کۆتاییـەك، سـەرەتایەکی نوێیـە. منـیش لەگـەڵ وتنـی "هەڵوەدا" دا، دەڵێم: "مەرحەبا". دیسانەوە سڵاو دەنێرم بۆ دۆستە کۆنـە کۆننـەبووەکانم. دەخـوازم تـەبایی و پێکـەوەییمان کۆتاییـان پێنەیەت. چونکە پـێم وایـە زۆر شـت هـەن، دەتـوانین لـە یەکدییان وەربگرین.

هەمووتانم زۆر خۆش دەوێت.



# ئامۆژگارییەکانی ئیمام ئەعزەم
# بۆ سەرکەوتن و سەرفرازی

## ئیسلامییەت واتە ئینسانییەت

"بەهێزییەکان، ئەو جوانییانەن
که سەرکەوتنەکان بەهادارتر دەکەن"
(مۆلەر)

ئیمام ئەعزەم (ئەبو حەنیفە) زانایەکی گەورەی ئیسلامە. لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی دەوڵەمەند و پایەدار بووە. ئەم پیاوە بژاردەیە، کەسێکی بەخشندەی وا بووە کە خەڵکیی هەم لە زانست و هەمیش لە

سامانەکەی سوودمەند کردووە. بەو جۆرە توانیویەتی گەلێك قوتابیی وەك خۆی سەنگین پێبگەیەنێت.

ئیمام ئەبو یووسف یەکێکە لەو قوتابییە بەڕێزانەی ئەو پێی گەیاندوون. ئەبو یووسف لە خێزانێکی تا بڵێی هەژار بووە. بۆیە لەلایەکەوە خەریکی کارکردن و لە لایەکی دیکەشەوە بەتاسەوە خەریکی خوێندن بووە. کە ئیمام ئەعزەم بەم حاڵەی زانیوە، بەدەمییەوە چووە و کۆمەکیی ماددیی کردووە. ئیتر ئەبوو یووسفیش بەتەواوی خووی داوەتە خوێندن.

ئەبو یووسف کە یەکەم فەقێی ئیمام بووە، لە ماوەیەکی کورتدا گەیشتووە بە پلەیەکی زۆر بەرز و بووە بە زانا و کەوتووەتە خزمەت کردن بە ئاینی ئیسلام.

کاتێك ئەبو یووسف لە مامۆستاکەی جیا دەبێتەوە بۆ ئەوەی بچێت بۆ بەسرە، ئیمام ئەعزەم هەندێك ئامۆژگاریی ئەم فەقێ خۆشەویستەی دەکات، کە هێمای زانست و دونیابینیی ئەون.

ئەم ئامۆژگارییە بەنرخانە کە ڕێگاکانی هەڵکردن لەگەڵ خەڵکی و بەو هۆیەشەوە سەرکەوتن و ئاسوودەیی و بەختیاریی دەستنیشان دەکەن، منیش حەزم کرد لە کۆتایی ساڵی خوێندندا، وەك یادگارییەکی خۆش پێشکەشی ئەو قوتابییانەمی بکەم کە لێیان دادەبڕام.

لەبەرئەوەی ئیمام ئەبو یووسف لەو شوێنەدا کە بۆی چووە، پابەندیی ئەو ئامۆژگارییانەی کردووە، هەم ڕێز و خۆشەویستیی خەڵکی بەدەست هێناوە و هەمیش سوودێکی زۆری پێگەیاندوون. چونکە ئەم ئامۆژگارییانە، پوختەی ئەو ئەزموون و دونیابینییانەیە کە ئەو زانا گەورەیە بەدرێژایی تەمەنی خۆی، دەستی کەوتوون. ئێستا با گوێ بۆ ئیمام ئەعزەم ڕادێرین:

"– بزانە، ئەگەر لەگەڵ خەڵکیدا هەڵنەکەیت، ئەوە لێت دەبن بە دوژمن. تەنانەت دایك و باوکیش وان. خۆ ئەگەر لەگەڵ خەڵکیدا، با خزم و خوێشیشت نەبن، بەباشی هەڵبکەیت، ئەوە بۆت دەبن بە دایك و باوك.

بۆ نموونە: کە دەچیت بۆ بەسرە و لەوێ دەگەیت بەوانەی ڕا جیاییتان هەیە، ئەگەر بێت و خۆت لەوان پێ گەورەتر بێت و بەهۆی بڕوا بوونت بە زانیارییەکانت ئەوان بەکەم بزانیت، ئەوە ئەوانیش بە هەمان شێوە لێت دەڕوانن. تۆ جنێویان پێبدەیت، ئەوانیش جنێوت پێدەدەن. باسی کارە ناڕەواکانیان بکەیت، ئەوانیش تۆ بە هەمان شت تۆمەتبار دەکەن. ئەو کات ڕووی تۆ و ئێمەشت لەگەڵدا ناشیرین دەکەن و، دەگەیتە ئەو قەناعەتەی پێویستە جێیان بهێڵیت و لێیان هەڵێی.

به ڕای من ئەم جۆرە هەڵسوکەوتانە دروست نین.

ڕووخـۆش نـەبوون لەبەرانبـەر ئەوانـەی پێویسـتە لـە ئاسـتیاندا ڕووخۆش بین، ئاقڵی نییە. بۆیە کە دەچیتە بەسرە، بەجوانی لەگەڵ ئەوانەدا بجووڵێوە کە دێنە پێشوازیت.

هەموو کەسێك، نرخی خۆی پێبدە.



ڕێز لە شەرەفمەندان بنێ.

قەدری زانایان بگرە.

خۆشـیی بخـەرە دڵـی بەساڵاچووانەوە.

لەبەرانبەر گەنجان سۆز بنوێنە.

هیچ پیاوماقووڵێك بەکەم مەزانە.

نەکەی کەس بچووك بکەیتەوە.

چاکی و نەرمونیانیت بە گشت کەسێك پیشان بدە. لـێ ڕازەکانـت بۆ کەس مەدرکێنە.

بێ ئەوەی کەسێك تاقی بکەیتەوە، متمانەی پێنەکەیت.

دۆستایەتیی کەسانی ساویلکە و چاوچنۆك مەکە.

خوو مەدە شتانێك ببنە هۆی ئەوەی خەڵکی قێزت لێبکەنەوە.

ڕوو مەدە کەسانی سەفیە و هەوەسباز.

خەندە لە ڕووت نەبڕێ.

جڵەوی نەفست بکە و دان بەخۆدا بگرە.

بەقەد تۆسقالێك لە خووی جوان دوور مەکەوەوە.

هەمیشە سینگ فراوان بە.

گرنگی بە جلوبەرگەکانت بدە.

ئەو ئاژەڵەی سواری دەبی، باشی بەخێو بکە.

بۆنی خۆش خۆش لە خۆت بدە.

با سفرەت کراوە بێ، چونکە قەت دەستقوچاو نابێ بە دەمڕاستی خەڵکی.

لەڕێی هاوڕێکانتەوە ئاگاداری هەواڵی کۆمەڵگە بە. زانیت گەندەڵییەك هاتووەتە ئاراوە، دەستبەجێ خۆتی بگەیەنێ تا چاکی بکەیتەوە. با هەواڵی ئیشە باشەکانیشت بۆ بێت، هەوڵ بدە بەهێزتریان بکەیت.

ئەوەی سەری لێدایت، نەکەی سەری لێببڕی. بەڵام ئەوەش کە نایەت بۆ لات، فەرامۆشی مەکە.

چاکە بکە لەگەڵ ئەوانەی چاکەت لەگەڵ دەکەن و ئەوانەش کە نایکەن.

هەمیشە لێبووردە بە.

بەردەوام ڕووت لە کاری چاکە بێت.

ئەو شتەی پەیوەندیی بە تۆوە نییە، چاوتی لێدابخە. خۆت لە هەر شتێك بەدوور بگرە کە ئازارت دەدات.

هـەقی هـەموو کەسـێك بزانــە و بدە.



ئەگــەر یــەکێك لــە هاوڕێکانــت نــەخۆش کــەوت، خــۆت بــڕۆ ســەری لێبدە. دواتر پیاوەکانـت بنێـرە لای و لە ئەحواڵی بپرسە.

هەر کات یـەکێك لـە هاوڕێکانـت لەبەر چاوان ون بوو، سۆراغی بکە. ئەگەر یەکێکیان خەریك بـوو لێـت دوور دەکەوتەوە، تۆ خۆتی زیاتر لێ نزیك بخەوە.

ئەوەندەی لە دەستت دێ، دۆستایەتی بۆ هـەموو کەسـێك پیشـان بدە. سڵاو لە گشت کەسێك بکە. تەنانەت پیاوە خراپەکانیش لە سڵاو کردن مەحرووم مەکە.

ئەگەر هات و لەگەڵ کەسانێکدا کۆڕتان بەست و لەو میانەیـەدا لـە دەرگای کۆمەڵە باسێك درا و هەمووان قسـەگەلێکیان کـرد کـە لەگـەڵ زانیارییەکانی تۆدا ناکۆك بوون، تۆ ئەو قسانەی خۆت مەکە کە دژ بـە هی ئەوانە. خۆ ئەگەر پرسیاریان لێکردیـت، ئـەوە بڵـێ کـە هـەمووان دەزانن ئاوایە و بەڵگەش ئەوەیە. ئیتر کە گوێیان لێت بـوو، گـەورەیی و نرخی خۆت و وتـەکانتیان بـۆ ڕوون دەبێتـەوە. خـۆ ئەگـەر وتیـان: "ئەم قسانە هی کێن؟"، تۆ بڵێ: "هی چەند هزرڤانێکن" و بەسـەریدا

تێپەڕە. ئەگەر ئەم حاڵەتە بەردەوام ببێت و ڕابێن، ئەو کات نرخت دەزانن.

ئەوانەی کە بەردەوام دێن بۆ سەردانیت، هەر یەکە و بەپێی ئاستی خۆی، چەردەیەك زانستی پێببەخشە.

ڕووخۆش بە و جار جارێك گاڵتەش بکە. چونکە دۆستایەتی وا لە فێرخوازان دەکات درێژە بە خوێندنەکەیان بدەن. ناو بە ناو دەعوەتی خواردنیان بکە. کاریان بۆ ڕابپەڕێنە. لە بار و زرووفیان تێبگە. چاو لە هەڵە و تاوانەکانیان بپۆشە. ئاسانکارییان بۆ بکە. نەیەڵی وا هەست بکەن لێیان وەڕس بوویت. وەلحاسڵ، بە جۆرێك بجووڵێوە وەك ئەوەی یەکێك بیت لەوان.

هەوڵ بدە ئاگات لە خۆت بێت و خۆت بپارێزیت.

ئەرکێك نەخەیتە سەر شانی یەکێك پێی هەڵنەگیرێت.

ئەگەر ئەوان بە شتێك دڵخۆش بوون، تۆش لەبەر خاتری ئەوان بەو شتە دڵت خۆش بێت. هەمیشە نیازپاکییت پیشان بدە.

بەقەد تۆزقاڵێك لە هەقیقەت دانەبڕێیت.

خۆت بەدوور بگرە لە خۆبەگەورە زانین. ناهەقیشت بەرانبەر کرا، ستەم مەکە. ئەگەر ناپاکیشت بەرانبەر کرا، هەر وا بە کە جێی متمانە بیت، لە ئەمەکداریی جوێ مەبەوە.

باوەش بە تەقوادا بکە.

لەگـەڵ پـەیڕەوانی گشـت ئاینێکـدا هەڵسـە و دانیشـە و لەگـەڵ هەمووشیاندا بەجوانترین شێوە ڕەفتار بکە."

***

ئـەم ئامۆژگارییانـەی ئیمـامی ئـەعزەم کـە بـۆ دەسـت خسـتنی سەرکەوتن و کامەرانیی کردونی، کرۆکی ئاکاری ئیسلامیش پێکدێنن. چونکە پێغەمبەر ﷺ بە غەیری ئەمانە نەجووڵاوەتەوە.

لـە ڕۆژگـاری ئەمڕۆمانـدا چـەندین کتێـب دەربـارەی ڕێگاکـانی سەرکەوتن و کامەران بـوون دەنووسرێن. ئیمـامی ئـەعزەم پوختـەی ئـەوەی لـەو هـەموو کتێبـە دێتـە نووسـین، لـەڕێی ئـەبو یووسـفی قوتابییەوە دەیگەیەنێتە ئێمە.

وەك لـەم ئامۆژگارییانەشـدا دیـارە، خووڕەوشـتی ئیسـلامیی ڕێگەیەکی مرۆییانەیە کە گشت جوانییەکانی لەخۆدا کۆکردووەتەوە.

چونکە ئیسلامییەت واتە ئینسانییەت. ئیسلام میتۆدی خـۆشمێری و هەست ناسکی و پێکەیشـتوویی و سـەرکەوتووییە. بـەهیچ جۆرێـك ڕێگا بە دڵڕەقی و قین و خوێن و دووبەرەکی نادات.

بۆیە ئەوانەی دەیانەوێت لە بەربـەرەڵلایی و تـیرۆر و شـەڕ و شـۆڕ ڕزگاریان بێت، لەسەریانە پەیڕەویی ئیسلام بکەن.



# ئیسلام ئاینی ئاشتی و خۆشەویستییە

## نامەکەی ئیلکنوور

"باشترین ڕێی پاراستنی ئاشتی،
ئامادەییە بۆ جەنگ."
(ج. واشنتن)

ئازیزەکەم ئیلکنوور!

لە حاڵ و ئەحواڵ پرسرانم لەلایەن کەسێکی وەك تۆوە کە زۆر لام بەقەدرن، ئەگەر لەسەر کاغەزیش بێت، زۆر خۆشە. هاتنی نامەکەت لەم ئان و ساتەدا کە ئەو کۆمەڵگەیەی من تێیدام بەدەست کێشەکانییەوە دەناڵێنێ، زۆری دڵخۆش کردم.

مرۆڤی کامڵ ئەو کەسەیە دەتوانێت باز بەسەر کێشەکانی خۆیدا بدات و کێشەی کەسانی تریش بە هی خۆی بزانێت. بێگومان ئەمە لە

توانای هەموو کەسێکدا نییە. ئەوانەی خاوەن گەوهەرێکی تایبەتن، دەتوانن بەسەر خۆپەرسی و من منۆکیدا زاڵ ببن و قووڵ بیر بکەنەوە.

ئا منیش لەبەرئەوەی پێم وایە ئیلکنوور خاوەنی ئەم تایبەتمەندییەیە، دۆستایەتیی ئەوم بەهەند وەرگرتووە. ئەو نامەیەشی کە نیشانەی بەردەوامیی ئەو دۆستایەتییەیە، زۆر پێی دڵشاد بووم.

## چۆن دەتوانرێ حوکمێکی ڕاست لەسەر قورئان بدرێ؟

ئینجا با بێینە سەر پرسیارەکانت... بێگومان ئەوەی بۆی چوویت ڕاستە: لە ئیسلامدا زۆرلێکردن نییە. ئەوەش هەر ڕاستە کە پێت وایە: ناکرێ یەك دوو ئایەت لە کۆی قورئان دەربهێنرێ و بڕیار لەسەر کۆی قورئان تەنها بەوانە بدرێ. بێگومان ئەمە بۆ هەموو کتێبێکی تریش هەر ڕاستە. مەگەر قسەی خەڵکیش هەر وا نییە؟! بۆی هەیە بە دەرهێنانی یەك دوو ڕستە لە گوتارێکدا، مانایەکی وا دەربهێنرێ کە ڕێك پێچەوانەی مەبەستی گوتارەکە بێت. لەم ڕوانگەیەوە ناپلیۆن گوتەزایەکی هەیە:

"ئێوە مەعسوومانەترین ڕستەی دونیام پێبڵێن، تا من بەو ڕستەیە مەحکوومی لە سێدارەدانتان بکەم."

ئینجا کتێبێکی وەك قورئان کە هەر ئایەتێکی بووە بە جێباسی سەدان لاپەڕە لە تەفسیر، هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لێی لەڕێی چەند ئایەتێکەوە، ئەوە هیچ مومکین نییە. چونکە قورئان ڕایەڵێکی پتەوی بیر و مەنتیق لەخۆ دەگرێت.

ئایەتەکان یەکدی پشتڕاست و ڕوون دەکەنەوە. قورئان دەست بۆ گشت بابەتەکانی ژیان دەبات. گشت ئەمانەش لە ٦٦٦٦ ئایەتدا. بۆیە بابەتەکان بەپێی گرنگییان بە شێوەی زۆر ڕوون، کەمێك ڕوون، کەمتر ڕوون یانیش شاراوە باسکراون. بێگومان هۆکاری دیکەش هەن بۆ ئەمە. بۆ نموونە: ئەو ڕوون کردنەوانەی تایبەتن بە پێشڤەچوونە تەکنۆلۆژییەکان، ئەگەر بە شێوەی زۆر ڕوون و ئاشکرا بخرابانا بەر باس، بۆ کۆمەڵگەیەکی ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر، دەبوو بە شتێك جێی باوەڕ نەبێ. ئینجا خۆ قورئانیش نە کتێبێکی مێژووییە نە کتێبێکە تایبەت بێت بە تەکنۆلۆژیا یان سروشت... بەڵام وێڕای ئەمەش، وەك پەرجویەك خۆی لە قەرەی گشت بابەتێك داوە. هەندێك جار بە هێمایەك هەموو شتەکانی بە شێوەیەکی ڕاست ڕوون کردووەتەوە. ئێستاشی لەگەڵدا بێت، ڕێی زانست ڕۆشن دەکاتەوە. سەرباری

ئەمەش وەك كتێبێكی نزا و پەرستش دەمێنێتەوە. ئا لەم ڕووەوە، ئەوەی كە قورئان وتەی مرۆڤ نییە، ڕوون و ئاشكرایە.

لە مەسەلەی پەرجو بوونی قورئانیشدا، ئەوە بەقەد زانا موسوڵمانەكان، زانا ناموسوڵمانەكانیش دانی پێدا دەنێن و لەم بارەیەوە قسەیان هەیە. لە هەر دوو كتێبی خۆمدا بە ناوەكانی «ئیسلام لە ڕۆژەڤی گێتیدا» و «ئەوانەی بەرەو ئیسلام هاتوون»، بە دوور و درێژیی ئەوانەم باس كردووە. وا بزانم ئەو دووانەم پێداویت. ئەگەر پێم نەدابی، حەز دەكەم لە (سەحەر) و ئەوانی وەربگریت و چاوێكیان پێدا بخشێنیت...

ئەگەر بتوانی چاوێك بە كتێبی « *Islam als Alternative*»ی (موراد هۆفمان) و « *Kuran kunde für Christin*»ی پرۆفیسۆر (پۆڵ شوێرزینۆ) لە بابەتی قورئاندا بخشێنیت، باشە... هەر چەندە لەم بوارەدا ئەوەندە پێویستمان بە فێر بوون لە ئەڵمانییەكان نییە... لێ هەندێ جار ئەوان باشتر قەناعەت پێهێنەرن. ئەگەر بۆ تۆش نەبێ، دەشێ بۆ هاوڕێكانت وا بێت...

## حەزرەتی موحەممەد ﷺ

## پێغەمبەری ئاشتییە

ئینجا با بێینە سەر ئەو ئایەتانەی پرسیارت دەربارە کردوون... قورئـان و شـێوازی خرانـە واری ژیانییـەوە، کـە خـۆی لـە ژیننامـەی حەزرەتی موحەممەد ﷺ دا دەبینێتەوە، تایبەتمەندییـەکی بەرچـاوی هەیـە. ئـەو تایبەتمەندییـەش تـەناهی و ئاشـتیی و دژایـەتیی شـەڕە. قورئانی پیرۆز دەفەرموویت: ﴿وَ الصُّلْحُ خَيْرٌ﴾ - النسـاء/١٢٨، واتـە "پێکهاتن چاك(تر)ە".

بۆیـە گشـت ئـەو شـەڕانەی لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا ﷺ کـراون، مەبەست لێیان بەرگریی بووە. ئەو ڕێسا بێڕەحمانـەی جـەنگ کـە لـە چاخەکانی ناوەڕاستدا کاریان پێکـراوە، ئـەو پێغەمبـەرەﷺ تەنانـەت لـەو کاتانەشـدا کـە زۆری بـۆ هـاتووە، کـاری پێنـەکردوون. هەمیشـە لێبووردە و بەخشـندە بـووە. لـەو هەلومەرجـەی ئـەو کاتانـەدا کـاری مرۆڤدۆسـتیی وای کـردوون کـە کـەس لێـی ڕانـەهاتووە. ئـەو هەڵسوکەوتانەی ئەو کردوونی، ئێستاشی لەگەڵدا بـێ، نـابینرێ بێنـە کردن. بۆ نموونە: لە دوای جەنگی بەدردا - ئەو جەنگەی کـە بەسـەر ئـەو دوژمنەیـدا سـەرکەوت کـە ژمـارەی جـەنگاوەرانی سـێ هێنـدەی موسـوڵمانەکان بـوو، تەنانـەت سەرسـەختترین هێرشبەرانیشـی

لەبەرانبەر ئەوەدا کە دە منداڵ فێری خوێندەواری بکەن، ئازاد کردووە.

ئەوەی لە پێنجەم ئایەتی سوورەتی (التوبة)دا هاتووە، هی کاتی جەنگە. بت پەرستانی مەککە زۆر بێبەزەییانە پەلاماری موسوڵمانانیان دەدا. موسوڵمانانیش لەبەرانبەر ئەو جۆرەها ئەشکەنجەدانانە، چۆکیان دانەدا. وەك دوا چارەش، ناچار ماڵ و حاڵی خۆیان جێهێشت و کۆچیان کرد بۆ مەدینە. بەلام بت پەرستان هەر وازیان لێنەدەهێنان. هێرشیان بردە سەر مەدینە... جارێکیش نا، چەند جار... ڕێککەوتنیان مۆر دەکرد، پاشان پێشێلیان دەکرد. خودای گەورە دەستنیشانی ئەو ڕێوشوێنانە دەکات بۆ موسوڵمانان کە پێویستە بیگرنە بەر لەبەرانبەر ئەو بێباوەڕانەی کە پێیان وا بوو تا موسوڵمانان لەسەر زەوی نەسڕنەوە ناحەوێنەوە، پێیان دەفەرمووێت: ﴿فَإِذَا انسَلَخَ الأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ وَ خُذُوهُمْ وَ احْصُرُوهُمْ وَ اقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ﴾ التوبة:٥، واتە: "جا کە مانگە حەرامەکان بەسەر چوون، لە هەر جێیەك دەستتان گەیشتە هاوبەش دانەرە (پەیمان شکێن)ەکان، بیانکوژن، یان یەخسیریان بکەن و ئابلووقەیان بدەن. بۆیان دانیشن (و بۆسەیان بۆ بنێنەوە)، لە هەر شوێنێك لەبار بێت".



سەیر بکە، ئەم ئایەتە تەنانەت بۆ کاتی جەنگیش هەندێك بنەما دەستنیشان دەکات، ئینجا بنەماگەلێکی ئاشتییانەش... داوا دەکات لە مانگە حەرامەکاندا کە شەڕ کردن تێیاندا باو بووە، شەڕ نەکرێ.

داوا دەکات لەو چوار مانگەی کە بە مانگە حەرامەکان ناسراون، شەڕ ڕابگیرێت. ئینجا نافەرمووێ دەمودەست هێرش بەرنە سەر ئەوانەی هێرشتان بۆ دێنن، بەڵکو دەفەرمووێ لەو شوێنەی لێین، بیانکوژن. واتە دەفەرمووێ ئەگەر هێرشیان هێنایە سەرتان، دایان بەسەر مەدینەدا، بیانکوژن. باشە، ئەی چاوەڕێ دەکرێ چی تر بوترێ لەبەرانبەر ئەوانەی بۆ کوشتار دێن؟!... چی لەوە سروشتیترە مرۆڤ لەبەرانبەر هێرشدا بەرگریی لە خۆی بکا و لە شەڕێکدا کە لەدژی ڕاگەیەنراوە دوژمنەکەی بکوژێ؟! بەڵام دەڵێ ئەگەر کرا بیانگرن، زیندانییان بکەن. کەواتە ئەگەر بکرێ نەکوژرێن و بگیرێن یان خۆ بەدەستەوە بدەن، پێویست ناکات بکوژرێن. بەشێوەیەکی زۆر ڕوونیش ئاماژە بە قەدەغەکردنی هێرش بردن دراوە: ﴿وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ﴾ بۆیان دانیشن (و بۆسەیان بۆ بنێنەوە)، لە هەر شوێنێك



لەبار بێت... واتە لەبەرانبەر هێرشی دوژمندا بێدار بن و نەیەڵن غافلگیر بکرێن و بکوژرێن.

لە درێژەی ئەم ئایەتەشدا بنەمای سەرەکیی چەمکی ئاشتیی گەردوونی لە ئیسلامدا دێتە ڕوون کردن:

﴿فَإِنْ تَابُوا وَ أَقَامُوا الصَّلاَةَ وَ آتَوْا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ﴾، واتە: "خۆ ئەگەر تۆبەیان کرد (لەو کارەیان) و نوێژیان کرد و زەکاتیان دا، ئەوە (وازیان لێبێنن) و ڕێیان بەردەن".

کەواتە ئەگەر بێت و دوژمن وێڕای ئەو هێرش و زیانانەی گەیاندوویانە، تۆبە بکەن و پەشیمان ببنەوە لەوەی کردوویانە و ئیسلام قبووڵ بکەن، ئەوە ئیتر دەبن بە برای ئێوە، بۆ لەوەودوا دەبنە بەشێك لە ئێوە... ئەو ئەرکەی لەسەر موسوڵمانە، ئەوەیە ئیتر لەو ئان و ساتەوە ئەوان بەتەواوی ئازاد بکەن.

## کەس بەزۆر ناکرێ بە موسوڵمان

ئازیزەکەم ئیلکنوور!

پێم وایە ئەم تێگەیشتنە ئاشتیخوازانەیە، ئێستاشی لەگەڵدا بێ لە دونیای ئەمڕۆدا کاری پێناکرێت. تۆ واز بێنە لەوەی بەرانبەر دوژمنی گیانی بەگیانی دەکرێ، بەڵکو هەندێ جار لەناو هەمان میللەتدا و تەنانەت لەناو ئەوانەی هەڵگری هەمان بیروباوەڕیشن، هیچ لێك تێگەیشتنێك نییە و زۆر بێڕەحمانە هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکدا دەکەن.

ئایەتی ٢٩ی سوورەی (التوبة) چارەسەرێکی تر بۆ کاتی جەنگ دەستنیشان دەکات: ﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَ لاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَ لاَ يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَ رَسُولُهُ وَ لاَ يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَ هُمْ صَاغِرُونَ﴾، واتە: "بجەنگن دژ بەو کەسانەی نێو ئەهلی کیتاب (فەلە و جوولەکە) کە باوەڕ نە بە خودا و نە بە ڕۆژی دواییش ناهێنن و پەیڕەوی لەم ئاینە هەقە ناکەن، تا ئەو کاتەی بەناچاری جزیە دەدەن". ئەمەش بەو مانایەی لە کاتی شەڕ لەگەڵ دوژمناندا، بەزۆر مەیانکەن بە موسوڵمان. ئەگەر ویستیان لەسەر ئاینی خۆیان بمێننەوە، ئەوە ڕێککەوتنیان لەگەڵدا بکەن. بێگومان لەنێو خاڵەکانی ئەو ڕێککەوتنەدا، ئەو سەرانەیەش کە پێی دەوترێ (جزیة)، بوونی هەیە. ئەی چما لە ڕۆژگاری ئەوڕۆشماندا بیمەی شەڕ لەلایەنی ژێرکەوتوو

وەرناگیرێ؟ وێڕای ئەمەش، خۆ ئەمە بەس بیمەی شەڕ نییە، بەڵکو گوزارشتە لەوەش کە بەدرێژایی ئەو ماوەیەی پابەندی خاڵەکانی رێککەوتنەکە دەبن، ئاشتی و سەلامەتییان لە هەموو ڕوویێکەوە پارێزراوە.

## ئەو سوورەتەی (بیسمیللا)
## لە سەرەتاکەی نەهاتووە

ئێستا دەمەوێت شتێکت بۆ ڕوون بکەمەوە، کە زۆر جێی سەرنج و تێڕامانە. سەرجەم سوورەتەکانی قورئان بە (بیسمیللا) دەست پێدەکەن. واتە (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيم) کە بە مانای (بە ناوی خودای بەخشندەی دلۆڤانەوە) دێت، سەرەتای گشت سوورەتێکە. وەلێ ئەمە لە سەرەتای سوورەتی (التوبة)دا نەهاتووە. ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەم سوورەتە باس لە هەلومەرجی جەنگ دەکات. بۆیە بەناچاری باس لە بارودۆخێك دەکات کە لەگەڵ لێبووردەیی خوادا نەسازە. قورئان وەك چۆن باسی گشت لایەنەکانی ژیان دەکات، ئاوا باسی جەنگیش دەکات. وێڕای ئەوەی ئەو هەموو بنەما ئاشتیخوازانەیەی جەنگی هێناوە، بەڵام ئەمە حاڵەتێکی هەڵاوێرراوە. ئەوەش هەیە کە تەنها لە کاتی ناچاریدا جێبەجێ دەکرێ. ئینجا خۆ حاڵەتێکیش نییە ئیسلام هێنابێتی یان دایهێنابێت.

ئەو خودایەی کە لە هەموو سیفەتەکانی زیاتر، یادی ناوەکانی (الرحمن، الرحیم – بەخشندە، دلۆڤان)ی دەکەین، بە هیچ جۆرێك خوازیاری شەڕ و شۆڕ نییە. ئینجا خۆ ژیانیش بێ شەڕ نابێ. دەفەرمووێت ئەگەر پێویستی کرد، ئەوەی پێویستە بیکەن...

## ئیسلام چۆن دەڕوانێتە کوشتار؟

بۆ تێگەیشتن لە ئایەتی ٣٢ی سوورەتی (المائدة)، وا پێویست دەکات سەیرێکی ئایەتەکەی پێشی بکەین. کە وامان کرد، زۆر چاك بۆمان دەردەکەوێت کە ئیسلام چەند بە خراپە لە کوشتن دەڕوانێت و چەند بە گەورەیی لە مافی مرۆڤ لە ژیان دەڕوانێت:

﴿مَنْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَ مَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا﴾ – المائدة/٣٢، واتە: "ئەوەی کەسێك (بە ناهەق) بکوژێت، (واتە) لە (تۆڵەی) کوژرانی یەکێك یان (ئەنجامدانی) بەدکارییەك (ی گەورە) لەسەر زەوی نەبێت، ئەوە وەك ئەوە وایە تەواوی خەڵکیی کوشتبێت. ئەوەشی (کەسێك) لە مردن ڕزگار بکات، وەك ئەوە وایە تەواوی خەڵکیی لە مردن ڕزگار کردبێت".

هەرچی ئایەتی ٣٣ی هەمان سوورەتیشە، بەم جۆرە درێژەی دەداتێ:

﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَ رَسُولَهُ وَ يَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَ أَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلاَفٍ أَوْ يُنفَوْا مِنْ الأَرْضِ﴾، واته: "سزای ئەوانەی دژی خودا و پێغەمبەرەکەی دەجەنگن و هەوڵ دەدەن بەڕەڵلایی لەسەر زەوی بڵاو بکەنەوە، ئەوەیە کە بکوژرێن یان لە خاچ بدرێن یان دەست و قاچیان بەپێچەوانەوە ببڕرێ، یانیش بۆ شوێنێکی دیکەی سەر زەوی دەربەدەر بکرێن".

ئایەتی ٣٤یش بەم شێوەیە درێژەی پێدەدات:

﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾، واتە: "تەنها ئەوانە(یان) نەبێ کە بەر لەوەی دەستتان بیانگاتێ، تۆبەیان کردووە. دە بزانن خودا (گەلێك) بەخشندە و میهرەبانە".



باشە، ئەم ئایەتانە دەربارەی چ ڕووداوێك دابەزیون؟ ئەمە زۆر گرنگە. ئەم ئایەتانە دەربارەی ئەو کەسانە دابەزیون کە پێشێلی ئەو ڕێککەوتننانەیان کردووە کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ مۆریان کردووە، ڕێگرییان کردووە، هەڵساون بە بڵاوکردنەوەی بەربەڕەڵلایی لەسەر زەوی، ماڵی موسوڵمانانیان بەتاڵان بردووە، دەستدرێژییان کردووەتە سەر ژنان... ڕێگەیەکی تر نەبووە بۆ

ڕاگرتنــی ئــەم جــۆرە کەســانە. ئــەو بەرەنگاربوونــەوە و جەنگانــە لەگــەڵیان لــە ماوەیــەکی کەمــدا بووەتــە هــۆی لــەناو بردنیــان و ئــیتر پێویست بــە جێبــەجێ کردنــی ئــەو حوکمــەی ئــەم ئایەتــە داویــەتی، نەماوە.

سەرتاپای مێــژووی مرۆڤایــەتی ئــەم دیــو ئــەو دیــو بکــرێ، ئــەهلی ئاینێك نادۆزرێتــەوە بەقــەد موسوڵمانان ســزایان ســووك بــێ، هێــرش نەبەن، بەزەییان تەنانەت بەوانەشدا بێتەوە کە هەڵدەکوتنە سەریان، زوو و بە ئاسانی ببوورن.

ئێستاشی لەگەڵدا بێ، ئەوەی ڕووبــەڕووی ستــەم دەبێتــەوە بــەڵام ستەم ناکات یان کەمترین پەرچەکرداری هەیە، موسوڵمانانن. ئەوەش کە موسوڵمانانی ئەمڕۆ تا چەند پابەندی لە قورئان دەکــەن، ئــەوەش بۆ خۆی جێی مشتومڕە.

ئینجا نادیدە گرتنی ئەو هەموو ئایەتەی قورئان کە لێوان لێون لــە ئاشتی و لێبووردەیی و، زەق کردنەوەی تەنها و تەنها ئەو ئایەتانــەی کــە بــاس لــە هەلومــەرجی شــەڕ و ڕێوشــوێنە پێویســتەکانی بەرپــەرچ دانەوەی هێرشەکان دەکەن و گەورەکردنی لە ڕاددە بەدەریان، خــۆی بۆ خۆی کارێکی دوژمنکارانەیە.

## بۆ لە ئیسلامدا زۆر لێکردن نییە؟

ئازیزەکەم ئیلکنوور!

لە ئیسلامدا زۆر لێکردن نییە: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِـي الـدِّينِ﴾ البقرة:٢٥٦.
بۆ؟ چونکە کە زۆر لە بێباوەڕێك دەکەیت، ڕەنگە لە ترسدا ببێت بە موسوڵمان، کە ئەمەش دیسان لەگەڵ ئیسلامدا یەك ناگرێتەوە. چونکە بە تێڕوانینی ئیسلام، خراپترین حاڵەت دووڕوویی (مونافیقی)یە. واتە ئەوەی ناوەوە شتێك و دەرەوەش شتێکی تر بێت. کەسێك باوەڕ لە دڵیدا نەبێ و لە دەرەوەش وا دیار بێت کە موسوڵمانە، ئەوە ئەوکاتە زۆر لە بێباوەڕ خراپترە. ئیسلام ڕێنمایی خەڵکی دەکات بۆ ئەوەی ناوەوە و دەرەوەیان وەك یەك بێت. تەنانەت کەسێك لە بێباوەڕییدا ڕاستگۆ بێت، واتە نکوولێکاریی دەربخات، زۆر باشترە لەوەی دووڕوو بێت.

ئەرکی سەرشانی موسوڵمانیش ئەوەیە کە خەڵکی لە باوەڕ نزیك بکاتەوە، نەك دووریان بخاتەوە و بیانخاتە حاڵەتێکی خراپترەوە...

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: "الصُّلْحُ سَيِّدُ الأَحْكَامِ" واتە: " ڕێککەوتن گەورەی بڕیاردانەکانە". بۆیە موسوڵمانی کامڵ لە هەموو بابەتێکدا، هەتا هەلی ڕێککەوتن هەبێ، خوازیاری شەڕ و پێکدادان نابێت. ئەگەر خوازیاری بێت، ئەوە ئەوکات بە گوێرەی ئیسلام نەجووڵاوەتەوە. ئەوەی کە موسوڵمانان بەدرێژایی مێژوو زۆر جار

چەوسێنراونەتەوە و ژێرکەوتوون، بەهۆی ئەم زیهنییەتە ئاشتی پەروەرانەیەیانەوە بووە.



کەسێك باوەڕی بە ڕۆژی دوایی هەبێت، قین لە دڵ نابێ بەرانبەر هیچ کەسێك، لە ناخیدا پەرە بە هەستی دووبەرەکی نادات. هەرگیز بیری لای زیان گەیاندن نابێت.

## بۆچی لە ئیسلامدا ڕێگە بە شەڕ دراوە؟

کەواتە شەڕەکانی ئیسلام هەمیشە دژ بە هێرشکەرانە. ئینجا دوای ئەوەش کە سەرجەم ڕێیەکانی ئاشتی بێسوود دەبن... زۆر جار لەگەڵ بێباوەڕانیشدا ڕێککەوتننامە مۆر کراوە و تا کۆتاش پابەندی لەو ڕێککەوتنانە کراوە.

لە ژیانی ڕۆژانەشماندا دەبینین کە تەنانەت کەسە هەرە ئاشتی خوازەکانیش، تووشی حاڵەتی وا دەبن ناچار دەبن دەست بکەنەوە و

شەڕ بکەن. خودای گەورە لە کەسانی ناتێگەیشتوو و شەڕانیی بمانپارێزێت. ئەگەر ببینین کەسێك کە بانگەشەی ئەوە دەکات ئاشتیخوازە خەریکی شەڕکردنە، دەبێ بە لەبەرچاو گرتنی هەلومەرجەکە و ئەوانەی هان لەبەرانبەریدا، هەڵسەنگاندنی بۆ بکەین.

ئینجا با بێینە سەر نموونەکانی شەڕ و شەڕخوازیی لە ئینجیل و تەوراتدا... هەموو ئەوانە ئەوە دەردەخەن کە ئەم کتێبە خواییانە لەگەڵ کاتدا دەستکاری کراون و شێوێنراون. پیشاندانی ئەو پێغەمبەرانەی کە خودا بۆ ئەوە ناردوونی تا ئاشتی و تەبایی لەسەر زەویدا بەرپا بکەن، وەك ستەمکار و پیاوکوژ، شتێکە لەگەڵ ئەقڵ و ژیریدا ناکۆکە. ئێ خۆ لەبەر شێوێنرانی ئەو کتێبانەیە، قورئانی پیرۆز وەك دوا کتێب نێردراوە. بۆیە ئەو جوو و فەلانەی پەیڕەوییان لەو کتێبە شێوێنراوانە کردووە، ڕێیان بەخۆیان داوە بکەونە پەلاماردانی خەڵکی و بەتایبەتیش موسوڵمانان.

بۆیە ناکرێ ئەو هێرش و پەلامارانەی ئەو جفاکانەی وەك پەیڕەوکاری ئاینی مەسیحی و یەهوودی دەردەکەون بە ڕاست بزانین. تەنانەت وڵاتانی موسوڵمانیش جار جار ئەگەر ئەوەندەش نەبێت، لەم مەسەلەیەدا هەڵەیان بووە. بێگومان ناتوانین ئەمانەش بە ڕاست دابنێین. چونکە پەلاماردان و خوێن و قین، نە لە قورئان و نە لە فەرموودەشدا جێیان نییە. بۆ نموونە: ئەگەر پێوەرمان قورئان و



پێغەمبەر ﷺ بێت، نابێ بە هیچ جۆرێك ستەمكارییەكانی سەددام بە ڕەوا بزانین.... چما هەر سەددامە؟! ئەگەر بزووتنەوەكانی خۆشمان دادگەرانە نەجووڵێنەوە، نابێت بەرگرییان لێبكەین...

چونكە ئەگەر بێت و ئێمە وەك موسوڵمان، بەرگری لەو ناهەقییانە بكەین، ئەوە دەكات ناهەقیمان بەرانبەر بە قورئان و پێغەمبەرﷺ كردووە. چونكە زۆر كەس لە دەرەوەی خۆمان، ئیسلامەتی بە گوێرەی كار و كردەوەی ئێمە هەڵدەسەنگێنێت. ئەگەر هەر كارێك كە موسوڵمانان دەیكەن، وایدابنێین سەرچاوەكەی لە قورئانی پیرۆزەوەیە، ئەوە ئەو كات دەبێ پێشمان وا بێ كە ناهەقی و درۆ كردن و مەی خواردنەوەش قورئان ڕێی پێداون.

## بۆچی قورئان باسی دۆزەخ و سزای دۆزەخ دەكات؟

ئینجا با بێینە سەر ئەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز كە باسی دۆزەخ و سزای بەسوێی دۆزەخ دەكەن... ئەمانە هۆشیاریدانن بۆ ئەوەی مرۆڤ خاوەنداریتیی لە ئاسوودەیی و كامەرانیی بكات. بۆ مەگەر لە دونیاشدا ئەوانەی پابەندی یاساكان نابن، هۆشدارییان نادرێتێ؟ بۆ لە

دونیاشدا سزادان نییە؟ دونیایەك سزا و زیندانی تێدا نەبێ، ئیتر لەوە دەمێنێ جێی ژیان بێت؟ مەگەر حاڵی ئەم دونیایە نابینین کە وێڕای ئەو هەموو سزادانانە حاڵی چۆنە؟!

ئینجا سزاش بەپێی ئەو ماف و ئیمتیازانەی دراون، قورس دەبن. ئایا سزای سەرپێچیی سەربازێك و مارشاڵێك وەك یەکە؟ ئێمەی مرۆڤیش مارشاڵی بوونەوەرانین. خودای گەورە ئێمەی وەك مرۆڤ، واتە وەك پایەدارترین زیندەوەر خولقاندووە و گشت بوونەوەرەکانی دیکەی خستووەتە ژێر ڕکێف و فەرمانی ئێمەوە... هەڵبەتە ئەم بەرزی و ئیمتیازەش، ئەگەر ئەرکی سەرشان بەجێ نەهێنرێ، دەبێ سزای وەربگیرێت. لێ خودا حەز ناکات بەندەکانی ڕووبەڕووی سزادان ببنەوە، بۆیە بە مەبەستی هۆشیارکردنەوە و دوورەپەرێز کردنیان، یەك لەسەر یەك و بە کاریگەرترین شێوازیش، باسی دۆزەخیان بۆ دەکات. دەفەرموێت: "ئامان ئاگاتان لە خۆتان بێت و دوور بکەونەوە، ئامان بە جۆرێك نەجووڵێنەوە کە شایستەی چوونە ئەوێ بن." کەچی مەخابن سەرباری ئەو هەموو هۆشیاریدانانەش، دەبینین مرۆڤەکان زۆر بە کەمی گوێ بەو پەیامە دەدەن. کەواتە ئەگەر کەمێك نەرمتر هۆشیاریی بدایە، کەس گوێی بۆ نەدەگرت. ئەگەر توندیی یاساکانی پۆلیسی ئەڵمان و شلوشەقیی هی خۆمان بەراورد بکەین، ئەوسا بۆمان دەردەکەوێت هۆی ئەو ڕێکوپێکییەی ئەوێ و

ئـەو بێسـەروبەرییەی لەمـەڕ خۆمـان چـییە. بێگومـان ڕێکـوپێکیی پێویستی بە یاساکانی سزا هەیە.

ئینجا خۆ هیچ پێویست ناکات کەسی ڕێك و دروسـت لـە پـۆلیس و سـزا و زینـدان بترسـێت. بەدەگمـەن نـەبیٚ، کەسـە سـەر ڕاسـت و ئابڕوومەندەکان ڕێیان هەر لە پاداشت دەکەوێت نەك سزا. ئینجـا خـۆ لـەپاڵ دۆزەخـدا، بەهەشـتیش هـەس. ئـەو شـوێنەش کـە خـودا خوازیاریەتی بۆ بەنـداکانی، ئەوێکەیـە. مەبەسـتی ئەوەیـە بـە دۆزەخ هۆشداریی بدات و بخاتە بەهەشتەوە. واتە مەبەست لـە دۆزەخ، بـاس کردنی بەهەشتە. قەدری ڕۆژیش ناگیریٚ، تا نەگاتە شەو.

## هاوار و ناڵە لە دەست خراپە



ئازیزی من، ئیلکنوور!

دەڵێـت: "هەسـت بـە نـامۆیی دەکـەم"... "چ شـادییەك بـۆ ئەوانەیـە کـە نـامۆن" ئەمـە فەرمایشـتی خۆشەویسـتە ﷺ. چـونکە ئەوانـەی کێشـەی موسوڵمانان بـە هـی خۆیـان

دەزانن و دەیکەن بە خەمی خۆیان، هەمیشە هەست بە نامۆ بوون دەکەن. بۆ هەمیشە؟... چونکە دونیا هەمیشە لێوان لێو بووە و دەبێت لە کێشە... ئەوان تەنانەت لە خۆشییەکانیشیاندا هەمیشە تاڵی و لە دڵشادییەکانیشیاندا هەمیشە دڵشکان هەیە. بەڵام ئای ئەمە چەند جوان و چەنێکیش پیرۆزە! ئەوانەی خۆیان تەنها لە ئارەزووەکانی گەدە و زایەندا نابیننەوە، هەمیشە مەحکوومی نامۆیین... ئەوان لەگەڵ گشت ڕووت و ڕەجاڵێکدا هەڵدەلەرزن و لەگەڵ گشت برسییەکیشدا هەست بە برسێتی دەکەن.

ئەوەی بە «لایەنی لاوازی»تی دادەنێیت، ئەگەر ڕاستت دەوێ لایەنی بەهێزیتە... بەرزییەکە لە هاوتەمەنەکانتدا و بگرە لەوانەشدا کە هۆش و بیریان لای خۆیانە، نییە. ئاخر من لەبەر ئەو لایەنەتە کە خۆشم دەوێیت و لام قەدر گرانیت. توخوا با ئەو لایەنە (بە قسەی خۆت) لاوازەت هەر بمێنێت...

"ئەوەی لە ڕاست ناهەقیدا بێدەنگی دەنوێنێ، شەیتانێکی بێ زمانە"، ئەوەی وا دەڵێت ڕەسولوڵلایە ﷺ. ئەو ڕۆحەت کە دەیەوێ لە ئاست خراپییەکاندا بزریکێنێت، دڵنیام ئیلهام لەو زاتەوە وەردەگرێت. ئەگەر ڕاستت دەوێ بێکەڵکیی ئێمە بەهۆی ئەوەوەیە کە لە ئاست خراپەکارییەکاندا دەستەوئەژنۆ دانیشتووین. ئەوە حاڵەتی تۆ، حاڵەتێکی ڕۆحیی شایان بەو پێغەمبەرەیە ﷺ کە

دەفەرمووێت: "من رءا مِنكم مُنكَرا فليغيِّره بِيدِه، فمَن لم يستطِع فبِلسانه، و مَن لم يستطِع فبِقلبه، و ذلك أضْعَفُ الإِيمانِ"، واتە: "هەر یەکێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی، با هەوڵ بدا بەدەست ڕاستی بکاتەوە. ئەگەر پێی نەکرا، با بە زمان ڕێگریی لێبکات. خۆ ئەگەر ئەوەشی پێنەکرا، با بە دڵی ناپەسەندی بکات. ئەمەش نزمترین پلەی باوەڕە"... ئەمە لە تۆدا هەیە. زۆر دڵخۆش بووم بەوەی بەو حاڵەتم زانیی.

ئێستا کە دەچینە نێو ساڵێکی نوێوە، زۆر دڵخۆشم بەوەی هاوڕێیەکم هەیە هەڵگری خەمێکە و منیش هەستەکانی خۆمی لەگەڵدا بەش دەکەم. مادام ئیلکنوورێك هەیە، زۆر شاد و گەشبینم بە ئایندە و لاوان. بێگومان گەلێك هاوشێوەی تریشی هەیە. ئەگەر سەرباری ئەو هەموو هەلومەرجانەی کۆسپن لەبەردەم بیرکردنەوە، لە بەرلیندا ئیلکنوورێك هەبێ بەم هەستە جوانانەوە، چ شادییەکە بۆ ئێمە!... موژدە بێت لە ئایندەمان!...

هیوادارم ڕۆژێك ئەو شتانەی لە ناختدا وەك هاوارێکی بێدەنگ کۆبوونەتەوە، ڕۆژێك وەك زانست و ئاکار و باوەڕ، تیشك ئاسا پرشنگ بدەنە دەوروبەرەکەت...

خۆ ئەگەر ئێستا دووی شەو نەبوایە، ئەوە دێڕەکانی منیش بە ئیلهام وەرگرتن لە تۆ، درێژ دەبوونەوە...

بەڵام، مەترسە... جارێکی دی قسەکانم ئاوا درێژ ناکەمەوە. ئەمە وەك کەڵەکەبووێکی ئەو قسانەی دواکەوتوون و پێشتر نەتوانراوە بکرێن، وەریگرە.

خوازیاری ئەوەم هەموو شتێك وەك ئەوە بێت کە دڵە جوانەکەی تۆ دەیخوازێ، بەوپەڕی ئۆقرە لێهەڵگیراویشەوە چاوەڕوانی وەڵامتم. دیسان وەك ئیلکنوور و دیسان بە هەست و جۆشەوە... با هەر هیچ نەبێ، لەسەر ڕووی لاپەڕەدا پێت بگەم، باشە؟ بەڵام نەکەی چاوەڕوانی هاتنی بەهار بی، ها... تکا دەکەم، سەیری ئەو بەهارە بکە کە دەمێکە هاتووەتە ناختەوە...

لە کانگای دڵەوە لەشساغیی و کامەرانیی و سەرکەوتوویی بۆ تۆ و ناسیاوەکانی تر دەخوازم، لەگەڵ ڕێز و سڵاو.

**وەهبی وەقفاس ئۆغلوو**

# پێڕست